


# ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

**بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید**

**بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود**

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە
سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم
http://www.endeshe.net
andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com
http://www.facebook.com/Andeshalib
07501026400



# باوڵەکەی باوکم

ئۆرهان پاموک
وەرگێڕانی سامان کەریم



ناوی کتێب: باوڵەکەی باوکم
ناوی نووسەر: ئۆرهان پاموک
وەرگێڕانی لە تورکییەوە: سامان کەریم
بابەت: وتاری ئەدەبی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٨
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٢٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٤٦٩)ـی ساڵی (٢٠١٨)ـی پێ دراوە.

# ناوەرۆک

# باوڵەکەی باوکم

باوکم دوو ساڵ پێش مردنی باوڵێکی بچووکی دامێ کە پڕ بوو لە دەفتەر، نووسین و دەستنووسەکانی خۆی. وەک هەموو کات بە زمانێکی گاڵتەوە پێی وتم کە دەیەوێت دوای خۆی، واتە دوای مردنی، بیانخوێنمەوە.
کەمێک بەشەرمەوە وتی، "سەیرێکیان بکە، بزانە لەناویاندا شتێکی تێدایە کە بەکەڵک بێت. بەڵکو دوای من هەڵی بژێریت و بڵاوی بکەیتەوە."

لە نووسینگەکەمدا لەنێوان کتێبەکاندا بووین. باوکم نەیدەزانی باوڵەکە لەکوێدا دابنێت، دەخولایەوە و سەیری دەوروبەری دەکرد، وەک ئەوەی بیەوێت لە بارێکی زۆر تایبەتی ئازاربەخش ڕزگاری ببێت. دواتر شتەکەی دەستی لە گۆشەیەکدا دانا، کە سەرنجی ڕانەدەکێشا. کاتێک ئەم ساتە کۆتایی هات کە هەردووکمانی شەرمەزار دەکرد، وەک هەموو کات هەردووکمان گەڕاینەوە بۆ ڕۆڵەکانی ژیانی خۆمان، بۆ کەسایەتییە گاڵتەچییەکانمان، کە زیاتر ئاماژەی بە لایەنی سووکی ژیانی دەدا ئاسوودە بووین. بێ ئەوەی زۆر خەمبار ببین، باسمان لە بابەتی ئاسایی ژیان، کێشە

سیاسییه بێکۆتاکانی تورکیا و کارەکانی باوکم کرد، کە زۆربەیان بەسەرنەکەوتوویی کۆتاییان هاتبوو. لەیادمە، دوای ئەوەی باوکم ڕۆیشت، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک بەدەوری باوڵەکەدا خولامەوە بێ ئەوەی هیچ دەستکاریی بکەم. هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە بەم باوڵە بچووکە ڕەش و لەپێستدروتکراوە قەراغ خڕە ئاشنا بووم. کاتێک باوکم دەچوو بۆ گەشتێکی کورت، یاخود هەندێک جار لە ماڵەوە شتێکی دەبرد بۆ شوێنی ئیشەکەی، ئەم باوڵەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. دێتەوە یادم کاتێک منداڵ بووم، دوای ئەوەی باوکم لە گەشت دەگەڕایەوە، ئەم باوڵە بچووکەم دەکردەوە، دەستم لە شتەکانی ناوی دەدا، حەزم لە بۆنی قۆلۆنیا و بۆنی ئەو وڵاتە نامۆیە بوو کە لەناویەوە دەهات. ئەم باوڵە بەنیسبەت منەوە شتێکی سەرنجڕاکێش و ناسراو بوو، کە زۆرێک لە یادەوەرییەکانی منداڵیم و ڕابردوومی هەڵگرتبوو، بەڵام ئێستا، تەنانەت ناتوانم دەستکارییشی بکەم. بۆچی؟ بەدڵنیاییەوە بە هۆی ئەو نهێنییە قورس و ئاڵۆزەی ناویەوە بوو.

ئێستا باس لە واتای ئەم قورساییە دەکەم. کاتێک مرۆڤ خۆی لە ژوورێکدا توند دەکات، دەچێتە سووچێکەوە، لەسەر مێزێک دادەنیشێت، بە قەڵەم و کاغەز هەستی خۆی دەر دەبڕێت، ئەمە واتە ئەدەبیات.

بە هیچ شێوەیەک نەمدەتوانی دەستکاریی باوڵەکەی باوکم بکەم و بیکەمەوە، بەڵام بە هەندێک لە دەفتەرەکانی ناوی ئاشنا بووم. باوکمم بینیبوو کاتێک لە هەندێکیاندا شتی دەنووسی. ئەوە یەکەم جار نەبوو کە ئاگاداری

قورساییەکەی ناو باوڵەکە بم. باوکم کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو، لە کۆتایی ساڵانی ١٩٤٠دا، لە سەردەمی گەنجێتیدا، ویستبووی لە ئیستانبوڵ ببێت بە شاعیر، ڤالیری وەر گێڕابووە سەر زمانی تورکی، بەڵام نەیویستبوو لە وڵاتێکی هەژار و کەمخوێنەردا شیعر بنووسێت، وەک نووسەرێک ژیانێکی ئەستەم بژی. باوکی باوکم - باپیرم - بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو، باوکم سەردەمی منداڵی و گەنجێتیی بە ئاسوودەیی بەسەر بردبوو، نەیدەویست بە هۆی نووسین و ئەدەبیاتەوە نارەحەتی بچێژێت. تێدەگەم، ژیانی بە هەموو جوانییەکانیەوە خۆش دەویست.

یەکەمین ئەندێشە کە منی لە قورسایی ناو باوڵەکە دوور رادەگرت، بەدڵنیایی ترسی ئەوە بوو ئەو شتانەم بەدڵ نەبێت کە دەیانخوێنمەوە. لەبەر ئەوەی باوکیشم ئەمەی دەزانی، پێشبینیی کردبوو، بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی دەکرد، وەک بڵێی شتەکانی ناو باوڵەکەی بەجیددی وەر نەگرتووە. دوای بیستوپێنج ساڵ ژیانی نووسەری، بینینی ئەمە منی خەمبار دەکرد. بەڵام تەنانەت نەمدەویست لەبەر ئەوە لە باوکم توورە ببم کە بەگوێرەی پێویست ئەدەبیاتی بەجیددی وەر نەگرتبوو... ترسە ڕاستەقینەکەم، ئەو شتەی لە ڕاستیدا نەمدەویست بیزانم، ئەو گریمانەیە بوو کە باوکم نووسەرێکی باش بێت. لە ڕاستیدا لەمە دەترسام، بۆیە نەمدەتوانی باوڵەکەی باوکم بکەمەوە. لەسەروو ئەوەشەوە، نەمدەتوانی بەئاشکرا ئەم هۆکارە بە خۆم بڵێم، چونکە ئەگەر لە باوڵەکەی باوکمدا ئەدەبیاتێکی ڕاستەقینە و گەورە هەبووایە، ئەوا دەبوو ئەوەم قبوڵ بکردایە کە پیاوێکی زۆر

جیاواز لەناو باوکمدا هەیە. ئەمە شتێکی ترسناک بوو. چونکە سەرەڕای ئەوەی تەمەنیشم گەورە بوو، بەڵام دەمویست باوکم بەتەنها باوکم بێت، نەک نووسەر.

بە بڕاوی من، بوونبەنووسەر ئەوەیە کە مرۆڤ چەندەها ساڵ بەسەبرەوە کار بۆ ئەوە دەکات کەسە نهێنییەکەی دیکەی ناوی و ئەو دنیایە ئاشکرا بکات کە ئەو کەسەی دروست کردووە: کاتێک دەڵێم نووسین، سەرەتا مرۆڤێک دێتە بەرچاوم کە بەتەنها خۆی لە ژوورێکدا توند کردووە، لەسەر مێزێک دانیشتووە و چووەتەوە ناو خۆی، لە سایەی ئەمەشدا بە وشەکان دنیایەکی نوێ پێک دەهێنێت، نەک نەریتی ڕۆمان، شیعر و ئەدەبیات. پێدەچێت ئەم پیاوە یاخود ئەم ژنە تابیعە بەکار بهێنێت، سوود لە ئاسانکارییەکانی کۆمپیوتەر وەر بگرێت، یاخود دەتوانێت وەک من بۆ ماوەی سێ ساڵ بە قەڵەمی مەرەکەب لەسەر کاغەز بنووسێت. تاکو بنووسێت، دەتوانێت قاوە و چا بخواتەوە و جگەرە بکێشێت. هەندێک جار دەتوانێت لەسەر مێزەکەی هەڵسێت و لە پەنجەرەکەیەوە سەیری دەرەوە بکات، سەیری ئەو منداڵانە بکات کە یاری دەکەن، یاخود دیوارێکی تاریک، ئەگەر شانسیشی هەبێت، ئەوا دەتوانێت سەیری درەختەکان و دیمەنەکان بکات. دەتوانێت شیعر و شانۆنامە، یاخود وەک من ڕۆمان بنووسێت. هەموو ئەم جیاوازییانە لەدوای ئەوەوە دێت کە لەسەر مێزەکە دادەنیشێت و بەسەبرەوە دەچێتەوە ناو خۆی. نووسین، دەربڕینی ئەم چوونەوەناوخۆیە بە وشە، گەڕان و تێپەڕبوونی مرۆڤە بە ئارامی، پێداگری و دڵخۆشییەوە بەدوای دنیایەکی نوێدا. تا لەسەر مێزەکەم

دابنیشتمایە، وردەووردە وشەی نوێم بۆ ناو پەڕە بەتاڵەکە زیاد بکردایە، تاکو چەندها ڕۆژ و مانگ و ساڵ تێپەڕییایە، هەستم دەکرد کە دنیایەکی نوێم بۆ خۆم دروست کردووە، لەناو خۆمدا مرۆڤێکی ترم دۆزیوەتەوە، وەک کەسێک کە بەردبەبەرد پردێک، یاخود گومەزێک دروست دەکات. وشەکان بەردی ئێمەی نووسەرن. بە دەستدان لە وشەکان و هەستکردن بە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکدا، هەندێک جار بە سەیرکردنیان لە دوورەوە، هەندێک جار بە پەنجەکانمان، وەک بڵێی دەست بە نووکی پێنووسەکانماندا بهێنین، بە کێشانی قورساییەکانیان و بە جێگیرکردنیان، چەندەها ساڵ بە پێداگری، سەبر و ئومێدەوە دنیایەکی نوێ دروست دەکەین.

بە بڕوای من، نهێنیی نووسەربوون سەبر و پێداگرییە، ئەو ئیلهامە نییە کە نازانیت لەکوێوە دێت. بەلای منەوە ئەو وتە جوانەی کە لە زمانی تورکیدا دەڵێت "بیرهەڵکەندن بە دەرزی،" وەک بڵێی بۆ نووسەرەکان وتراوە. لە ئەفسانە کۆنەکاندا سەبری فەرهادم خۆش دەوێت، تێی دەگەم کە لەبەر عەشقەکەی شاخی کون کردووە. لە ڕۆمانەکەمدا، کە بە ناوی *من ناوم سوورە*وەیە، کاتێک باس لە نیگارکێشێکی کۆنی ئێرانی دەکەم کە چەندەها ساڵ بەتامەزرۆیی ئەوەندە هەمان ئەسپی کێشاوەتەوە، ئەزبەری کردووە، تەنانەت توانیویەتی بەچاونووقاوی ئەسپێکی جوان بکێشێت، دەمزانی کە باس لە پیشەی نووسین و ژیانی خۆشم دەکەم. بۆ ئەوەی نووسەر بتوانێت ژیانی خۆی وەک چیرۆکی کەسانی تر بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی لە ناخیدا هەست بە هێزی ئەم گێڕانەوەیە بکات، بە

بڕوای من پێویسته بەسەبرەوە لەسەر مێز چەندەها ساڵی بدات بەم هونەر و پیشەیە، دەبێت گەشبینییەک بەدەست بهێنێت. ئەو پەریی ئیلهامەی کە هەرگیز ناچێت بۆ لای هەندێک، زۆر سەردانی هەندێکی تریش دەکات و ئەم متمانە و گەشبینییەی خۆش دەوێت، لەو ساتەدا کە نووسەر هەست بە تەنهاییەکی زۆر دەکات، دەکەوێتە گومانەوە لە هەوڵ و خەیاڵ و بەهای نووسینەکانی، واتە ئەو ساتەی هەست دەکات چیرۆکەکە بەتەنها چیرۆکی خۆیەتی، وەک بڵێی ئەم پەرییە ئەو چیرۆک، وێنە و خەیالانەی پێشکەش دەکات کە ئەو دنیایە یەک دەخات کە لێوەی دەر چووە، لەگەڵ ئەو دنیایەی کە دەیەوێت دروستی بکات. لە پیشەی نووسەریمدا، کە هەموو ژیانم پێ بەخشیوە، بەنیسبەت منەوە هەژێنترین هەست ئەوە بووە کە نەک خۆم، بەڵکو وام زانیوە هێزێکی تر بەبەخشندەیی ئەو ڕستە و خەیاڵ و پەڕانەی داومەتێ کە زۆر دڵیان خۆش کردووم.

دەترسام لەوەی باوڵەکەی باوکم بکەمەوە و دەفتەرەکانی ناوی بخوێنمەوە، چونکە دەمزانی کە هەرگیز ناکەوێتە ئەو نارەحەتییەی منی تێدام، حەزی لە تێکەڵاویی هاوڕێکانی، قەرەباڵغی، کۆڕوکۆمەڵ، هۆڵەکان و گاڵتەکردنە نەک تەنهایی. بەڵام دواتر بە شێوەیەکی تر بیرم دەکردەوە: پێدەچوو ئەم بیرکردنەوە و نارەحەتیچەشتن و خەیاڵی سەبرە بڕیارێکی پێشینە بێت و لە ئەزموونی ژیان و نووسەربوونی خۆمەوە پێکم هێنابێت. زۆر نووسەریش هەبوون کە لەناو قەرەباڵغی و ژیانی خێزان و بریقەی کۆڕوکۆمەڵ و لەنێوان جیلوەی دڵخۆشیدا نووسیویانە. لەسەروو ئەوەشەوە، لە سەردەمی

منداڵیمدا، باوکم بە هۆی بێزاربوونی لە ژیانە ئاساییەکەی خێزانەکەمان جێی هێشتبووین، چووبوو بۆ پاریس، وەک زۆرێک لە نووسەران – لە ژووری ئوتێلەکاندا - دەفتەرەکانی پڕ کردبوو لە نووسین. دەشمزانی بەشێک لەو دەفتەرانە لەناو باوڵەکەدایە، چونکە ئیدی باوکم لەو ساڵانەی بەر لەوەی باوڵەکەم بۆ بهێنێت دەستی بە باسکردنی ژیانی ئەو سەردەمەی کردبوو. لە سەردەمی منداڵیشمدا باسی ئەو ساڵانەی بۆ دەکردم، بەڵام باسی لە دڵناسکی و ویستی بوونبە شاعیر/نووسەر و ناڕەحەتییەکانی شووناسی خۆی نەدەکرد، کە لە ژووری ئوتێلەکاندا هەستی پێ کردبوو. وەک کەسێک کە باسی هەواڵی زۆر گرنگ بکات لەبارەی ئەو کتێبانەی خوێندوویەتیەوە و ئەو فیلمانەی سەیری کردوون، بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە لە ناخەوە باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن بە شێوەیەکی تێروتەسەل لەسەر شۆستەکانی پاریس سارتەری بینیوە. هەڵبەتە هەموو کات لە مێشکی خۆمدا بەشێکی هۆکاری نووسەربوونم بۆ ئەوە دەگەڕانەوە، کە باوکێکم هەبوو لەماڵەوە زیاتر باسی لە نووسەرە جیهانییەکان دەکرد وەک لەوەی باس لە جەنەڕاڵەکان و گەورەپیاوانی دین بکات. بەڵکو بە بیرکردنەوە لەمە و لەوەی کە چەندە قەرزاری کتێبخانە گەورەکەی بووم، دەبووایە دەفتەرەکانی باوکمم بخوێندایەتەوە. دەبوو بێ ئەوەی زۆر گوێ بدەمە ئەو ڕاستییەی کە دەبوو وەک من لە ژوورێکدا لەگەڵ کتێبەکان و بیرکردنەوەکان بمایەتەوە و بچوونایەتە ناو یەک، هەروەها بە بێ ئەوەی زۆر گوێ بدەمە تایبەتمەندیی ئەدەبیی نووسینەکانی، تەماشام بکردایە.

بەلام کاتێک بەم نائاسوودەیییەوە سەیری ئەو باوڵەم دەکرد کە باوکم جێی هێشتبوو، هەستم دەکرد ئەو شتەی ناتوانم بیکەم، بەتەواوەتی ئەمەیە. هەندێک جار باوکم لەسەر کەرەوێتەی بەردەم کتێبخانەکەی ڕادەکشا، کتێب، یاخود گۆڤارەکەی دەستی دادەنا، بۆ ماوەیەکی درێژ دەکەوتە ناو خەیاڵ و بیرکردنەوەوە. شتێکی زۆر جیاواز، شتێکی وەک ئەوەی چووبێتەوە ناو خۆی لەسەر سیمای دەر دەکەوت، کە هەرگیز لە ژیانی ئاسایی، ڕابواردن و دەمەقاڵێ بچووکەکانی ناو خێزانەکەماندا ئەو شتەم نەبینیبوو، بەتایبەتی لە ساڵانی سەردەمی منداڵیم و سەرەتای سەردەمی گەنجێتیمدا لەوە تێدەگەیشتم کە باوکم نائاسوودەیە، ئیدی بەوە خەمبار دەبووم. دوای چەندین ساڵ، ئێستا لەوە تێدەگەم کە ئەم نائاسوودەیییە هۆکارێکی بنچینەیییە، کە مرۆڤ دەکات بە نووسەر. بۆ ئەوەی ببیت بە نووسەر، پێش سەبر و ناخۆشی، پێویستە لە ناخماندا پاڵنەرێک هەبێت و پاڵمان پێوە بنێت تا بتوانین خۆمان لە ژوورێکدا توند بکەین، بۆ ئەوەی لە جەنجاڵی، کۆمەڵ و ژیانی ئاساییی ڕۆژانە و ئەو شتانەی هەموو کەس دەیکەن هەڵبێین. سەبر و ئومێدمان بۆ ئەوە دەوێت بتوانین بە نووسین دنیایەکی قووڵ بۆ خۆمان دروست بکەین. بەلام ویستی خۆتوندکردن لە ژوورێکدا، لە ژوورێکی پڕ لە کتێبدا، یەکەم شتە کە ئێمە دەخاتە جووڵە. هەڵبەتە یەکەم نموونەی گەورەی نووسەری بێلایەن و ئازاد مۆنتاینە، کە دەستپێکی ئەدەبیاتی هاوچەرخە، بە کەیفی خۆی کتێبی خوێندۆتەوە، بەتەنها بە گوێگرتن لە ویژدانی خۆی لەگەڵ کەسانی تردا مشتومڕی کردووە، بە قسەکردن لەگەڵ

کتێبەکاندا بیرکردنەوە و دنیای خۆی پێک هێناوە. مۆنتاین نووسەرێک بوو کە باوکیشم هەموو کات نووسینەکانی دەخوێندەوە، ئامۆژگاریی منیشی دەکرد کە بیخوێنمەوە. لە هەرکوێیەکی دنیادا بم، لە ڕۆژهەڵات یاخود ڕۆژئاوا، دەمەوێت خۆم وەک پارچەیەکی نەریتی ئەو نووسەرانە ببینم کە خۆیان دادەبڕن لە کۆمەڵ و لە ژوورێکی پڕ لە کتێبدا خۆیان توند دەکەن. بە بڕوای من، دەستپێکی ئەدەبیاتێکی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤێک لە ژوورێکی پڕ لە کتێبدا خۆی توند بکات.

بەڵام ئەوەی ڕوونە، ئەوەیە لەو ژوورەشدا هێندە تەنها نین کە خۆمانی تێدا توند دەکەین. سەرەتا قسە، چیرۆک و کتێبی کەسانی تر، واتە ئەو شتەی پێی دەڵێن نەریت - هاوبەشیی ئێمە دەکات. پێم وایە ئەدەبیات بەبەهاترین کۆکراوەیە کە مرۆڤ دای هێناوە تا لە خۆی تێبگات. کۆمەڵگە مرۆییەکان، هۆزەکان و میللەتەکان بە هێندەی ئەوە زیرەک دەبن، دەوڵەمەند دەبن و پێش دەکەون، کە گرنگی بە ئەدەبیاتەکەیان دەدەن و گوێ لە نووسەرەکانیان دەگرن؛ وەک چۆن هەموومان دەیزانین، سووتاندنی کتێب و سووککردنی نووسەرەکان هەواڵی هاتنی دەمی تاریکی و گەمژەییی میللەتانە. بەڵام هیچ کاتێک ئەدەبیات بەتەنها بابەتێکی میللی نییە. ئەو نووسەرەی لەگەڵ کتێبەکانیدا لە ژوورێکدا خۆی توند دەکات، لە ناخی خۆیدا گەشتێک دەکات، دوای چەندەها ساڵ لەوێدا یاسا بنچینەییەکانی ئەدەبیاتێکی باش ئاشکرا دەکات: ئەدەبیات ئەو توانا و هونەرەیە کە باس لە چیرۆکی خۆمان بکەین، وەک بڵێی باس لە چیرۆکی

کەسانی تر دەکەین، باس لە چیرۆکی کەسانی تر بکەین، وەک بڵێی باس لە چیرۆکی خۆمان دەکەین. بۆ ئەوەی بتوانین ئەمە بکەین، بە چیرۆک و کتێبەکانی کەسانی تر دەست بە سەرەتای گەشتەکەمان دەکەین.

باوکم کتێبخانەیەکی هەزار و پێنج سەد کتێبیی باشی هەبوو، کە بەزیادەوە بەشی نووسەرێکی دەکرد. کاتێک لە تەمەنی بیستودوو ساڵیدا بووم، ڕەنگە هەموو کتێبەکانی ناو ئەم کتێبخانەیەم نەخوێندبێتەوە، بەڵام بە هەموویان ئاشنا بووم، دەمزانی کامیان گرنگە، کامیان سادەیە و بەئاسانی دەخوێنرێتەوە، کامیان کلاسیکە، کامیان پارچەیەکی گرنگی دنیایە، کامیان گەواهیدەرێکی باشی مێژووی ناوخۆیە کە لەبیر دەکرێت، کامیان کتێبی نووسەرێکی فەرەنسییە کە باوکم زۆر گرنگیی پێ دەدات. هەندێک جار لە دوورەوە سەیری ئەم کتێبخانەیەم دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە کە منیش ڕۆژێک لە ماڵێکی جیاوازدا کتێبخانەیەکی وەها، تەنانەت باشتریشم دەبێت، بە کتێبەکان دنیایەک بۆ خۆم دروست دەکەم. کاتێک لە دوورەوە سەیرم دەکرد، هەندێک جار بە شێوەیەک دەمبینی، وەک بڵێی کتێبخانەکەی باوکم وێنەیەکی بچووکی هەموو خێزانەکەم بێت. بەڵام ئەمە دنیایەک بوو کە لە گۆشەکەی ئێمەوە، لە ئیستانبوڵەوە سەیرمان دەکرد. کتێبخانەکەش ئەمەی پیشان دەدا. باوکم ئەم کتێبخانەیەی بەو کتێبانە پێک هێنابوو کە لە گەشتەکانیدا کڕیبوونی کاتێک چووبوو بۆ دەرەوەی وڵات، بەتایبەتی لە فەرەنسا و ئەمەریکا، لەگەڵ ئەو کتێبانەی لە سەردەمی گەنجێتییدا، لە ساڵانی ١٩٤٠ و١٩٥٠کاندا، لە ئیستانبوڵ لەو

دوکانانەدا کڕیبوونی کە کتێبی زمانی بیانییان دەفرۆشت، هەریەکەیانی لەو کتێبفرۆشە کۆن و نوێیانەی ئیستانبوڵ بەدەست هێنابوو، کە منیش پێیان ئاشنا بووم. دنیاکەی من تێکەڵەیەکە لە دنیای میللی، ناوچەیی و دنیای ڕۆژئاوایی. منیش بە شێوەیەکی جیددی لە ساڵی ١٩٧٠کاندا دەستم کرد بە پێکهێنانی کتێبخانەیەک. هێشتا بەتەواوەتی بڕیارم نەدابوو کە ببم بە نووسەر، وەک چۆن لە کتێبی *ئیستانبوڵ*دا باسم کردووە، بۆم دەر کەوتبوو کە ئیدی نابم بە وێنەکێش، بەڵام ڕێک نەمدەزانی ژیان بەرەو چ ڕێگەیەکم دەبات. لە لایەکەوە لە ناخمدا حەسرەتێکی زۆری خوێندنەوە و بەگەشبینی مەراقێکی زۆرم بۆ فێربوونی هەموو شتێک هەبوو؛ بە شێوەیەک لە شێوەکان لە لایەکیشەوە هەستم دەکرد ژیانێکی "پڕ لە کەموکورتی"م دەبێت و ناتوانم وەک کەسانی تر بژیم. بەشێک لەم هەستەم، وەک ئەو هەستەی ئەو کاتەی بە بیرکردنەوە لەوەی لە ناوەندەوە دوور بووم سەیری کتێبخانەکەی باوکمم دەکرد، لە دەرەوەی ئەو ناوەندە پەیوەندیی بە ژیانمەوە هەبوو، ئیدی لەو ساڵانەدا ئیستانبوڵ ئەم هەستەی دەدا بە هەموومان. خەمێکی تری کەموکوڕیی ژیانیش، بەدڵنیایی ئەوە بوو کە بەباشی دەمزانی لە وڵاتێکدا دەژیم کە پەیوەست نییە بە هونەرمەندەکانیەوە، ئومێدیان ناداتێ، ئیدی چ لە بواری وێنەدا، چ لە بواری ئەدەبدا. وەک بڵێی بمەوێت ئەم کەموکوڕییانەی ژیانم نەهێڵم، لە ساڵی ١٩٧٠کاندا، بەو پارەیەی باوکم دەیدامێ، بە گەرموگوڕییەکی زۆرەوە دەستم کرد بە کڕینی کتێبی کۆن و تۆزاوی لەو کتێبفرۆشییە کۆنانەی ئیستانبوڵ، کە دۆخی هەژاری،

پەرتوبڵاوی و پەرێشانییان، کە زۆربەی کات مرۆڤیان نائومێد دەکرد، کە لە قەراغ دوکانەکان، حەوشەی مزگەوتەکان و بن دیوارە دارماوەکاندا جێگیر ببوون، هێندەی ئەو کتێبانە کاری تێ دەکردم کە دەمویست بیانخوێنمەوە.

بیرکردنەوەم لەبارەی شوێنی منەوە لە دنیادا، ئەو هەستە بنچینەییەی ئەو زەمانە لەبارەی ئەدەبیاتەوە هەمبوو و هەمیشەش لە ژیاندا ئەو هەستەم هەر هەبووە، هەستی ئەوە بوو کە من "لەم ناوەندەدا نەبم." لە ناوەندی دنیادا ژیانێکی دەوڵەمەنتر و سەرنجڕاکێشتر هەبوو وەک لەوەی کە ئێمە دەیگوزەرێنین، من و هەموو ئیستانبوڵ و تورکیاش لە دەرەوەی ئەمە بووین. بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەمڕۆ ئەم هەستەم لەگەڵ زۆرینەی دنیادا هاوبەشی پێ کردووە. بە هەمان شێوە، دنیایەکی ئەدەبییش هەبوو کە ناوەندەکەی زۆر لە منەوە دوور بوو. لە ڕاستیدا ئەوەی بیرم لێ دەکردەوە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوایی بوو، نەک ئەدەبیاتی دنیا، ئێمەی تورک لەمەش دوور بووین. کتێبخانەکەی باوکیشم ئەمەی پشتڕاست دەکردەوە. لە لایەکی کتێبخانەکەدا کتێب و ئەدەبیاتی ئیستانبوڵی تێدا بوو، کە لەبارەی دنیاکەی خۆمانەوە بوو، زۆرێک لە وردەکارییەکانیم خۆش دەویست، نەمدەتوانی دەستبەرداری ئەو خۆشەویستییە ببم؛ لە لاکەی تریدا کتێبی دنیای ڕۆژئاوایی هەبوو، کە هیچ لەوان نەدەچوو، ئەم لێکنەچوونەش هەم ئازار و هەم ئومێدی دەدا بە ئێمە... وەک بڵێی نووسین و خوێندنەوە وەک ئەوەیە لە دنیایەک بچیتە دەرێ، پاشان لە جیاوازی، سەمەرەیی و خەیاڵە ناوازەکانی دنیاکەی تردا دڵدانەوە بدۆزیتەوە. هەستم دەکرد

هەندێک جار باوکیشم لەبەر ئەوە ڕۆمانی دەخوێندەوە تا لەو دنیایە ڕابکات کە تێیدا دەژی، بچێت بۆ دنیای ڕۆژئاوا، وەک چۆن دواتر منیش هەر وام کرد. یان ئەو کاتانە وەک بڵێی کتێبەکان بۆ من شتێک بوون بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە هەستی کەموکورتییە کولتوورییانە. نەک هەر خوێندنەوە، بەڵکو نووسینیش شتێک بوو وەک چوون و هاتن لەنێوان ژیانی ئیستانبوڵ و ڕۆژئاوادا. باوکم بۆ ئەوەی بتوانێت زۆربەی دەفتەرەکانی ناو باوڵەکەی پڕ بکاتەوە، چووە بۆ پاریس، خۆی لە ژووری ئوتێلەکاندا توند کردووە و دواتر نووسینەکانی هێنابووەوە بۆ تورکیا. کاتێکیش سەیری باوڵەکەی باوکمم دەکرد، هەستم دەکرد نائاسوودەم دەکات. کاتێک سەیری باوڵەکەی باوکمم دەکرد، ئیتر لەوە یاخی دەبووم کە بۆ ماوەی بیستوپێنج ساڵ لە ژوورێکدا خۆم توند کردووە بۆ ئەوەی لە تورکیادا وەک نووسەر بمێنمەوە، وەک ئەوەی نووسەربوون و ئەو نووسینانەی لە ناخەوە دەیاننووسین شتێک بن و پێویست بکات بە دزیی کۆمەڵگە، میللەت و دەوڵەتەوە بیکەین. بەزۆرییش لەبەر ئەوە لە باوکم تووڕە دەبووم، چونکە نووسەربوونی هێندەی من بەجیددی نەگرتبوو.

لە ڕاستیدا لەبەر ئەوە لە باوکم تووڕە دەبووم، چونکە ئەزموونی ژیانێکی وەک ئەوەی منی نەکردبوو، بێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ شتێک، لە کۆمەڵگەدا لەگەڵ هاوڕێ و خۆشەویستەکانیدا بەدڵخۆشی و بەدەم پێکەنینەوە ژیابوو. بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکانیش، دەمزانی لەجیاتیی بڵێم "تووڕە دەبووم،" دەمتوانی بڵێم "ئیرەییم دەبرد." پێدەچێت

ئەوە دەستەواژەیەکی ڕاستتر بێت، بۆیە نائاسوودە دەبووم. ئەو کات بە دەنگە نووساو و توورەکەم خۆم پرسیارم لە خۆم دەکرد، دەموت، "ئاسوودەیی چییە؟" ئاسوودەیی ئەوەیە کە وا بزانیت بەتەنها لە ژوورێکدا ژیانێکی قووڵ ژیاویت؟ یاخود ئەزموونکردنی ژیانێکی ئاسوودە ئەوەیە کە لەگەڵ کۆمەڵ و هەموو کەسدا باوەڕ بە هەمان شت بکەیت، بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت، وەک بڵێی باوەڕت هەیە؟ وەک بڵێی لەناو هەموو کەسێکدا بەگونجاوی دەژیت، لە لایەکی تریشەوە لە شوێنێکدا بەدزییەوە بنووسین کە کەس نایبینێت، ئایا هەر بەڕاستی ئەمە ئاسوودەییە، یاخود نائاسوودەییە؟ بەلام ئەمانە چەند پرسیارێکی پڕ لە هەڵەشەیی و توورەیی بوون. لەسەروو ئەوەشەوە، ئایا لەکوێوە ئەوەم هێنا کە ئاسوودەیی پێوەری ژیانێکی باشە؟ هەموو کات مرۆڤەکان، ڕۆژنامەکان و هەموو کەس وا دەر دەکەوتن، وەک بڵێی گرنگترین پێوەری ژیان ئاسوودەیی بێت. تەنانەت ئەمەش وای نەدەکرد بابەتەکە ببێتە شتێک کە شایانی لێکۆڵینەوە بێت و دەر کەوێت کە ئایا خۆی، یاخود ڕێک پێچەوانەکەی ڕاستە؟ ئایا چەندە باوکمم دەناسی، کە هەمیشە لە ئێمە و خێزانەکەمان هەڵدەهات، چەند نائاسوودەییەکانیم دەبینی؟

ئیتر بەم بیر و هەستانەوە بۆ یەکەم جار باوڵەکەی باوکمم کردەوە. بڵێی نائاسوودەییەک لە ژیانی باوکمدا هەبووبێت کە من پێم نەزانیبێت و بەتەنیا بە نووسینەوەی و بە هێشتنەوەی وەک نهێنی بەرگەی گرتبێت؟ هەر کە باوڵەکەیم کردەوە، بۆنی ناو باوڵی گەشتەکەی هاتەوە یادم، بێ ئەوەی زۆر بیر لە باوکم بکەمەوە، هەستم کرد کە چەندین ساڵ

پێش ئێستا ئەمانەی پیشان داوم. زۆربەی ئەو دەفتەرانەی دەستم تێوە دان و سەیرم کردن، لەو ساڵانەی سەردەمی گەنجێتیی باوکمدا نووسرابوون کە ئێمەی جێ دەهێشت و دەچوو بۆ پاریس. لەگەڵ ئەوەشدا من دەمویست وەک ئەو نووسەرانەی کە ژیاننامەیانم خوێندوونەتەوە و خۆشم دەویستن، بزانم باوکم، کاتێک لە تەمەنی مندا بووە، چیی نووسیوە و بیری لە چی کردۆتەوە. لە ماوەیەکی کورتیشدا تێگەیشتم کە ڕووبەڕووی شتێکی وەها نابمەوە. لەسەروو ئەوەشەوە، نائاسوودە بووبووم بەو دەنگی نووسەرەی کە لە چەند شوێنێکی دەفتەرەکانی باوکمدا بینیبووم. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم دەنگە دەنگی باوکم نییە؛ ڕاستەقینە نەبوو، یاخود ئەم دەنگە دەنگی ئەو کەسە نەبوو کە من بە باوکی ڕاستەقینەی خۆمم دەزانی. لێرەدا ترسێکی قورستر هەبوو لەو شتە نائاسوودەکەرەی کاتێک باوکم دەنووسێت، وەک بڵێی باوکم نەبێت: ترسی ناڕاستەقینەییەکەی ناخم ئەندێشەی ئەوەشی تێدەپەڕاند کە نووسینەکانی باوکم بە باش نەزانم، تەنانەت بینینی ئەوەی کە باوکم زۆر کاریگەر بووە بە نووسەری تر، دەبوو بە قەیرانی ڕاستەقینە، کە بوونم، ژیانم، ویستی نووسین و هەموو نووسینەکانی خۆمی دەخستە ژێر پرسیارەوە. لە یەکەم دە ساڵی ڕۆماننووسینمدا ئەم ترسەم زیاتر بەقووڵی هەست پێ دەکرد، بەرهەڵستیکردنی قورس بوو، هەندێک جار دەترسام لەوەی ڕۆژێک بدۆڕێم و بە هۆی ئەم ئەندێشەیەوە واز لە نووسینی ڕۆمان بهێنم، وەک چۆن وازم لە وێنەکێشان هێنا.

ڕاستەوخۆ باس لەو دوو هەستە بنچینەییە دەکەم، کە

لەگەڵ داخستن و هەڵگرتنی باوڵەکەدا لە مندا بەئاگا هات: هەستی ژیانکردن لە دەرەوەی ناوەند، ئەندێشەی ڕاستەقینە بوون... هەڵبەتە ئەمە یەکەم جارم نەبوو کە لە قووڵاییی ناخمەوە ئەم هەستە ناخۆشەم هەبێ. چەندەها ساڵ لەسەر مێزەکەی خۆم بە خوێندنەوە و نووسین لێکۆڵینەوەم لە هەموو پانتایی، ئەنجامە لاوەکییەکان، گرێ ناوەکییەکان و ڕەنگە هەمەچەشنەکانی ئەم هەستە کردبوو، دۆزیبوومەوە و تێیدا قووڵ ببوومەوە. هەڵبەتە هەندێک جار وەک ئازارێکی نادیار و هەستێکی کەیفکوژ ئەم ئەزموونانەم دەکرد، کە جارجارێک لەناو ژیان و کتێبەکاندا بە شێوەیەک لە شێوەکان مێشکمیان تێکەڵ دەکرد، بەتایبەتی لە سەردەمی گەنجێتیمدا. بەڵام بەتەنها بە نووسینی ڕۆمان، کتێب (بۆ نموونە، لەبارەی ژیانی دەرەوە - *بەفر، ئیستانبوڵ*؛ لەبارەی ئەندێشەی ڕاستەقینەبوونەوە - *من ناوم سوورە* یاخود *کتێبی ڕەش*)، توانیومە لەبارەی ئەم هەستانەوە بەتەواوەتی لە ژیانی دەرەوەی ئەو ناوەندە و ئەندێشەی ڕاستەقینەبوون بکەم. بە بڕوای من نووسەربوون واتا جەختکردن لەسەر ئەو برینە شاراوانەی کە کەم دەیزانین و لە ناخماندا زۆرمان هەڵگرتووە، دۆزینەوەی ئەم برین و ئازارانە، ناسین و دەرخستنیان بە شێوەیەکی باش، دەیانهێنێتە بارێک تا ببن بە پارچەیەک لە نووسینەکانمان و شووناسمان، کە بە خۆشەوە خاوەندارێتیی دەکەین.

نووسەربوون باسکردنە لەو شتانەی کە هەموو کەس دەیزانێت، بەڵام نازانێت کە دەیزانێت. دۆزینەوەی ئەم زانیارییە، گەشەسەندنی و هاوبەشپێکردنی لەگەڵ خوێنەراندا،

بە شێوەیەکی سەیر چێژەکانی گەڕان دەدات بە خوێنەر لەناو دنیایەکدا کە باش پێی ئاشنایە. هەڵبەتە ئەم چێژانە لە هونەری ئەو نووسینەشەوە وەر دەگرین، کە بە هەموو ڕاستییەکانیەوە باس لەو شتانە دەکات کە دەیانناسین. ئەو نووسەرەی کە خۆی لە ژوورێکدا توند دەکات، چەندەها ساڵ گەشە بە هونەرەکەی دەدات و کار دەکات بۆ ئەوەی دنیایەک دروست بکات، کاتێک لە برینە نهێنییەکانی خۆیەوە دەست دەکات بە کارەکەی، بیەوێت یاخود نەیەوێت متمانەیەکی قووڵیش پیشانی مرۆڤایەتی دەدات. هەمیشە ئەم هەستی متمانەیەم لەبارەی ئەوەی کە مرۆڤەکان لە یەکتری دەچن لە خۆمدا هەڵگرتووە، کەسانی تریش هاوشێوەی ئەم برینانەیان هەڵگرتووە و لەبەر ئەم هۆکارانەش تێدەگەن. ئەدەبیاتی ڕاستەقینە لەبارەی ئەوەی کە هەموو مرۆڤەکان لەیەک دەچن پشتی بە متمانەیەکی گەشبین و منداڵئاسا بەستووە. ئیتر ئەوەتا، کەسێک کە چەندەها ساڵ لە ژوورێکدا خۆی توند دەکات و دەنووسێت، دەیەوێت باس لە مرۆڤایەتییەکی وەها و دنیایەک بکات کە ناوەندی نییە.

بەدڵنیایی دنیا ناوەندێکی هەبوو کە دوور بوو لە ئێمەوە، وەک چۆن بە باوڵەکەی باوکمدا، بە ڕەنگە کاڵەوەبووەکەی ژیانی ئیستانبوڵماندا دیار بوو. لە کتێبەکانمدا زۆر باسم لەم ڕاستییە بنچینەییەی هەستی ژیانکردنی دەرەوەی ناوەندە چیخۆڤییە و ئەو ئەندێشەی ڕاستەقینەبوونە کردووە، کە ئەنجامی لایەنێکی تریەتی. بە خۆمدا دەزانم کە زۆربەی زۆری دانیشتووانی جیهان لەگەڵ ئەم هەستانەدا دەژین، تەنانەت بە شەڕکردن لەگەڵ ترسی وەک چەوسانەوە،

متمانەبەخۆنەبوون و بێبەهاییدا دەژین. بەڵێ، تاکو ئێستا یەکەمین کێشەی مرۆڤ بێموڵکی، بێخواردنی و بێماڵییە... بەڵام ئیتر تەلەڤزیۆنەکان و ڕۆژنامەکان بە شێوەیەک باس لەم کێشە بنچینەییانە دەکەن بۆ ئێمە، کە زۆر لە ئەدەبیات خێراتر و ئاسانترە. ئەگەر کێشەی بنچینەیی مرۆڤ ئەو شتە بێت کە پێویستە ئەمڕۆ ئەدەبیات بەڕاستی باسی لێوە بکات و لێی بکۆڵێتەوە، ئەوا پێویستە باس لە ترسی مانەوە لە دەرەوەی ناوەند، هەستی خۆبەکەمزانیین، هەستی بێبەهایی، کە پەیوەستە بە مانەوە، بەکۆمەڵ ئەزموونکردنی شکاندنی نەفسبەرزی، دڵشکاندن، ئەندێشەی کەمنرخاندن، ڕقی جۆراوجۆر، لەدڵگرتن و خەیاڵەکانی کەمنرخاندن، کە هەرگیز کۆتایی نایەت، شانازی و خۆهەڵکێشانە میللییەکان بکات، کە برای ئەم کێشانەن... هەموو جارێک کە سەیری تاریکاییەکەی ناخی خۆم دەکەم، دەتوانم لەم خەیاڵانە تێبگەم کە زۆربەی کات بە زمانێکی زۆر عاتیفی و بێعەقڵانە باسیان لێوە دەکرێت. لەم دنیایەی دەرەوەی ڕۆژئاوادا، کە دەتوانم بە شێوەیەکی ئاسان خۆمی پێ بچووێنم، گەواهیدەری ئەوە دەبین کە قەرەباڵغییە گەورەکان و کۆمەڵگەکان و میللەتان، بە هۆی ئەندێشەی کەمنرخاندن و لەدڵگرتنیانەوە، دەکەونە ناو ترسێکەوە کە هەندێک جار دەگاتە ڕادەی گەمژەیی. لە دنیای ڕۆژئاواشدا، کە بە هەمان شێوە دەتوانم بەئاسانی خۆمی پێ بچووێنم، دەزانم کە میللەتەکانیان و دەوڵەتەکانیان شانازییەکی هێندە زۆر بە دەوڵەمەندییەکەیانەوە دەکەن لەبەر ئەوەی ڕێنیسانسیان داهێناوە، ڕۆشنبیری و هاوچەرخیبوونیان دۆزیوەتەوە، هەندێک جار دەکەونە ناو

خۆبەدڵبوون و لەخۆباییبوونێکەوە، کە نزیک دەبێتەوە لە گەمژەییەکی هەمان شێوە.

کەواتە نەک تەنها باوکم، بەڵکو هەموومان زۆر زیاد گرنگی دەدەین بە بیرکردنەوەی ئەوەی دنیا ناوەندێکی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو شتەی کە چەندەها ساڵ ئێمە توند دەکات لە ژوورێکدا بۆ ئەوەی بنووسین، ڕێک بە پێچەوانەوە، متمانەیە؛ ڕۆژێک نووسینەکانمان دەخوێنرێنەوە و تێی دەگەن، چونکە ئەمە باوەڕێکە لەبارەی ئەوەی لە هەموو شوێنێکی دنیادا مرۆڤەکان لەیەک دەچن. بەڵام بە نووسینەکانی خۆم و باوکمدا دەزانم کە ئەمە گەشبینییەکی بریندار و دەردەدارە بە هۆی تووڕەیی مانەوەمان لە کەنار و دەرەوەی ئەو ناوەندەدا. زۆر جار لە ناخمدا هەستم بەو عەشق و نەفرەتەی دۆستۆیڤسکی کردووە، کە بە درێژایی ژیانی هەستی پێ دەکرد بەرامبەر بە ڕۆژئاوا. بەڵام ئەو شتە ڕاستییەی کە لەوەوە فێری بووم، ئەو سەرچاوەی ڕاستییە گەشبینە ئەوەیە کە ئەم نووسەرە گەورەیە بە بیرکردنەوەی لە پەیوەندیی نێوان عەشق و نەفرەت لەبارەی ڕۆژئاواوە، دنیایەکی زۆر جیاوازتری پێک هێنا کە لە سەروو ئەوانەوە بوو.

هەموو ئەو نووسەرانەی ژیانیان داوە بەم پیشەیە، ئەم ڕاستییە دەزانن: ئەو دنیایەی کە چەندەها ساڵ بە نووسینگەلێک پێکی دەهێنین لە ئەنجامی هۆکاری دانیشتنمان لەسەر مێزێک و نووسینمان، لە کۆتاییدا لە شوێنێکی زۆر جیاوازدا جێگیر دەبێت. لەسەر ئەو مێزەی کە بە خەمباری یاخود تووڕەییەوە دادەنیشین لەسەری، دەگەینە دنیایەکی

جیاوازتری سەروو ئەو خەمباری و توورەییە. بڵێی باوکیشم نەگەیشتبێتە دنیایەکی وەها؟ ئەو دنیایەی کە دوای گەشتێکی درێژ دەیگەیتێ، هەستی پەرجوویەک دەدات بە ئێمە، وەک دەرکەوتنی دوورگەیەک، کە چۆن دوای گەشتێکی درێژ بەناو دەریادا، کاتێک کەشە تەماوییەکە ڕوون دەبێتەوە، بە هەموو ڕەنگەکانیەوە بەهێواشی لەبەرامبەرماندا دەر دەکەوێت. یاخود ئەمە لەو شتانە دەچێت کە گەڕۆکە ڕۆژئاواییەکان هەستیان پێ کردووە، کاتێک بە کەشتی لە باشوورەوە نزیک بوونەتەوە و تەمی سەرلەبەیانی ڕوون بووەتەوە و ئیستانبوڵیان بینیوە. لە خاڵی کۆتایی ئەو گەشتە درێژەدا، کە بە ئومێد و مەراقەوە بۆی دەکەوێتە ڕێ، شارێکی تەواو، دنیایەکی تەواوی لێیە بە مزگەوت، منارە، ماڵ، کۆڵان، گرد، پرد و هەورازەکانیەوە. مرۆڤ یەکسەر دەیەوێت بچێتە ناو ئەم دنیا نوێیەی دێتە بەرامبەری، دەیەوێت تێیدا ون ببێت، وەک چۆن خوێنەرێکی باش ون دەبێت لەناو پەڕەکانی کتێبێکدا. لەبەر ئەوەی لە کەناردا، لە دەرەوەی ناوەنددا، توورەین، یاخود ڕێک لەبەر ئەوەی خەمبارین، لەسەر مێزێک دانیشتووین و دنیایەکی نوێمان دۆزیوەتەوە، کە ئەم هەستانەمان لەبیر دەباتەوە.

ئیتر بە بڕوای من ئیستانبوڵ ناوەندی دنیایە، ڕێک بە پێچەوانەی هەستی منداڵی و گەنجێتیمەوە. نەک بەتەنها لەبەر ئەوەی پێدەچێت هەموو ژیانم تێدا بەسەر بردبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی لە هەمان کاتدا سیوسێ ساڵە بە لەیەکچوواندنم لەگەڵ یەکبەیەکی هەموو مرۆڤ، کۆڵان، پرد، سەگ، چاوگی ئاو، قارەمانی سەیر، دوکان، سیماناسراو، سێبەری ترسناکی

نامۆ، خاڵە تاریک، شەو و ڕۆژەکانیدا باسم کردووە. ئەم دنیایەی خەیاڵم کردووە، لەدوای خاڵێکەوە لەدەستی من دەر دەچێت، لەناو سەرمدا، لەو شارە ڕاستەقینەترەی تێیدا دەژیم. ئەو کات، ئەو مرۆڤ، کۆڵان، شت و بینایانە وەک بڵێی هەموو پێکەوە لەنێوان خۆیاندا دەست دەکەن بە قسەکردن، وەک بڵێی لەناو خۆیاندا پەیوەندییەک پێک دەهێنن کە من پێشتر نەمتوانیوە هەستی پێ بکەم، وەک بڵێی نەک لە خەیاڵەکان و کتێبەکانی مندا، بەڵکو خۆیان بۆ خۆیان دەست دەکەن بە ژیانکردن. ئیدی بە بڕوای من ئەم دنیایەی کە بە سەبر و خەیال دروستم کردووە، وەک بڵێی بە دەرزی بیر هەڵبکەنم، لە هەموو شتێک ڕاستەقینەترە.

کاتێک سەیری باوڵەکەم دەکرد، دەموت با پێشینە بڕیار نەدەم بەرامبەر بە باوکم، ئەویش چەندەها ساڵی داوە بەم پیشەیە، بەڵکو ئەم جۆرە دڵخۆشییەی نووسەرەکانی دۆزیبێتەوە. سوپاسگوزاری ئەو بووم، چونکە باوکێکی ئاسایی نەبوو کە فەرمان بکات و شت قەدەغە بکات یان بیسەپێنێت و سزام بدات، هەموو کات منی ئازاد دەکرد، زۆر ڕێزی لێ دەگرتم. بە پێچەوانەی زۆرێک لە هاوڕێکانی سەردەمی منداڵیم و گەنجێتیمەوە، چونکە نەمدەزانی ترسی باوک چییە، هەندێک جار باوەڕم وا بوو کە هێزی خەیاڵم دەتوانێت بەئازادی یاخود منداڵئاسا کار بکات، لە ناخەوە بیرم لەوە دەکردەوە، لەبەر ئەوەی باوکم لە سەردەمی گەنجێتیدا ویستوویەتی ببێت بە نووسەر، من توانیومە ببم بە نووسەر. دەبووایە بە سنگێکی فراوانەوە نووسینەکانیم بخوێندایەتەوە، لەو شتانەی بگەیشتمایە کە لە ژووری ئوتێلەکاندا نووسیونی.

بە بیرکردنەوەیەکی گەشبینەوە باوڵەکەی باوکمم کردەوە، کە چەندەها ڕۆژ لەو شوێنەدابوو کە خۆی دای نابوو، هەموو ئیرادەم خستە کار و هەندێک لە پەڕە و دەفتەرەکانیم خوێندەوە. باوکم چیی نووسیبوو؟ دیمەنەکان لە ئوتێلەکانی پاریسەوە دێتەوە یادم، هەندێک شیعر و هەندێک دژە بیر و تێفکرین... ئێستا وەک کەسێک هەست بە خۆم دەکەم، کە چۆن دوای ڕووداوێکی هاتوچۆ بەئەستەم بیری ئەو شتانەی دەکەوێتەوە کە بەسەریدا هاتووە و ئەگەر زۆر لە خۆیشی بکات، نایەوێت زیاتری بیر بکەوێتەوە. لە سەردەمی منداڵیمدا، کاتێک دایکم و باوکم لەوەدا دەبوون دەست بکەن بە شەڕ، واتە کاتێک یەکێک لە بێدەنگییە کوشندەکان دەستی پێ دەکرد، باوکم یەکسەر ڕادیۆکەی دەکردەوە بۆ ئەوەی کەشەکە بگۆڕێت، چونکە موزیک زووتر ئەو شتانەی بیر دەبردینەوە کە ڕووی دابوو.

با منیش بابەتەکە بە یەک-دوو قسە بگۆڕم، کە خۆش دەویتسترێن و هەمان کاری موزیکەکە دەکەن! وەک دەزانین ئەو پرسیارەی زۆر خۆشەویستە و زۆر لە ئێمەی نووسەر دەکرێت ئەمەیە: بۆچی دەنووسیت؟ لەبەر ئەوەی لە ناخمەوە هەڵدەقوڵێت دەنووسم! لەبەر ئەوەی وەک کەسانی تر ناتوانم کارێکی ئاسایی بکەم دەنووسم. لەبەر ئەوەی کتێبی وەک کتێبەکانی من بنووسرێن و بیانخوێنمەوە دەنووسم. لەبەر ئەوەی تووڕەم لە هەمووتان، لە هەموو کەسێک، دەنووسم. لەبەر ئەوەی بە درێژاییی ڕۆژ لە ژوورێکدا دانیشتن لەسەر کورسییەک دڵخۆشم دەکات دەنووسم. لەبەر ئەوەی دەتوانم بەتەنها بە گۆڕینی ڕاستی بەرگەی ڕاستی بگرم

بۆیە دەنووسم. لەبەر ئەوەی هەموو دنیا بزانێت کە من، ئێمە و ئەوانی تر، هەموومان لە ئیستانبوڵ و لە تورکیادا ژیانێکی چۆن دەژین و ژیاوین دەنووسم. لەبەر ئەوەی بۆنی کاغەز و قەڵەم و مەرەکەبم خۆش دەوێت دەنووسم. لەبەر ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر باوەڕم بە ئەدەبیات و هونەری ڕۆماننووسینە دەنووسم. لەبەر ئەوەی نووسین ڕاهاتن و تامەزرۆییە دەنووسم. لەبەر ئەوەی دەترسم لەبیر بکرێم دەنووسم. لەبەر ئەوەی ئارەزووم لە ئەو ناوبانگ و پەیوەستییەیە کە دروستی دەکات دەنووسم. بۆ ئەوەی بەتەنها بمێنمەوە دەنووسم. لەبەر ئەوە دەنووسم بەڵکو تێبگەم کە بۆچی ئەوەندە بە ڕێژەیەکی زۆر تووڕە دەبم لە هەمووتان و لە هەموو کەس. لەبەر ئەوەی ئارەزووم لە خوێندنەوەیە دەنووسم. بۆ ئەوەی ئیتر ئەو ڕۆمان و نووسینانە، ئەم پەڕانە تەواو بکەم کە دەستم کردووە بە نووسینیان، دەنووسم. لەبەر ئەوەی هەموو کەس چاوەڕێی ئەمەیە لێم دەنووسم. لەبەر ئەوەی وەک منداڵێک باوەڕم بە نەمریی کتێبخانەکان و وەستانی کتێبەکانمە لە ڕەفەکاندا دەنووسم. لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو ژیان و دنیا، هەموو شتێک زۆر خۆش و سەرسوورهێنەرە دەنووسم. لەبەر ئەوەی بەوشەکردنی هەموو ئەو جوانی و دەوڵەمەندییەی ژیان چێژی هەیە، دەنووسم. لەبەر چێژەکانی دروستکردن و دارشتنی چیرۆک دەنووسم. وەک چۆن لە خەوندا ڕوو دەدات، لەبەر ئەوەی لەو هەستە ڕزگارم ببێت کە وەک بڵێی بە هیچ شێوەیەک ناتوانم بچم بۆ شوێنێکی تر، دەنووسم. لەبەر ئەوەی بە هیچ شێوەیەک دڵخۆش نابم

دەنووسم. بۆ ئەوەی دڵخۆش ببم دەنووسم.

هەفتەیەک دوای ئەوەی باوکم هات بۆ نووسینگەکەم و باوڵەکەی بۆ هێنام، دووبارە سەردانی کردم و پاکەتێک شوکولاتەشی هێنابوو، هەر وەک چۆن هەموو جارێک ئەمەی دەکرد (بیری دەچووەوە کە چلوهەشت ساڵم). دووبارە گفتوگۆمان لەبارەی ژیان، سیاسەت و قسەوقسەڵۆکی ناو خێزانەوە کرد و پێکەوە پێکەنین. باوکم بۆ ساتێک چاوی گیر بوو لەو گۆشەیەی کە باوڵەکەی لێ دانابوو، تێگەیشت کە باوڵەکەم لەوێدا هەڵگرتووە، لام بردووە. چاومان کەوتە سەر چاوی یەک. بێدەنگییەکی بێزارکەر و شەرمهێن باڵی کێشا. چاوم لەسەر چاوی لا برد، پێم نەوت کە باوڵەکەم کردۆتەوە و هەوڵم داوە شتەکانی ناوی بخوێنمەوە. بەڵام ئەو تێگەیشت. منیش تێگەیشتم کە ئەو تێگەیشتووە. ئەویش تێگەیشت کە من تێگەیشتووم ئەو تێگەیشتووە. ئەم تێگەیشتنانەش لەناو چەند چرکەیەکدا چەند بخایەنێت، ئیتر هەر ئەوەندەی خایاند. چونکە باوکم کەسێک بوو کە متمانەی بە خۆی هەبوو، ئاسوودە و دڵخۆش بوو: وەک هەموو کاتێک دەستی کرد بە پێکەنین. کاتێکیش چووە دەرەوە و ڕۆیشت، وەک باوکێک، سەرلەنوێ ئەو قسە شیرین و بەجەرگکەرانەی دووبارە کردەوە کە هەمیشە پێی دەوتم.

بەئیرەیییەوە لەدواوە سەیری دۆخی دڵخۆشی و بێخەموخەفەتیی باوکم کرد. بەڵام لەیادمە ئەو ڕۆژە لە ناخمدا دڵخۆشییەکی شەرمهێن جووڵەی کردبوو. پێدەچێت هێندەی ئەو ئاسوودە نەبم، وەک ئەو ژیانێکی ئاسوودە و بێخەموخەفتم بەسەر نەبرد، بەڵام هەستی ئەوەی کە حەقی

نووسینم داوە، تێگەیشتن... لەبەر ئەوەی لەبەرامبەر باوکمدا هەستم بەمە دەکرد، شەرمم دەکرد. لەسەروو ئەوەشەوە باوکم نەبووبوو بە ناوەندی سەرکوتکەری ژیانی من، منی ئازاد کردبوو. پێویستە هەموو ئەمانە ئەوەمان وەبیر بهێنێتەوە کە نووسین و ئەدەبیات، لەگەڵ کەموکورتییەکی ناوەندی ژیانماندا، بەقووڵی بەستراونەتەوە لەگەڵ هەستی دڵخۆشی و تاوانبارێتیدا.

بەڵام ئەو ڕۆژە یەکسەر بیرم کەوتبووەوە چیرۆکەکەم لایەنێکی تری هەیە، کە زیاتر وای لێ دەکردم هەست بە تاوانباری بکەم. بیستوشەش ساڵ پێش ئەوەی باوکم باوڵەکەیم بۆ بهێنێت، کاتێک تەمەنم بیستودوو ساڵ بوو، وازم لە هەموو شتێک هێنابوو، بڕیارم دابوو ببم بە ڕۆماننووس، خۆم لە ژوورێکدا توند کردبوو، دوای چوار ساڵ یەکەم ڕۆمانم تەواو کردبوو بە ناوی *جەوردەت بەگ و کوڕەکانییەوە*، لەبەرگیراوەیەکی کتێبەکەم، کە بە تابیعە نووسرابووەوە و هێشتا بڵاو نەبووبووەوە، بە دەستی لەرزۆکەوە دابوو بە باوکم تا بیخوێنێتەوە و بۆچوونی خۆیم لەبارەی ڕۆمانەکەوە پێ بڵێت. چونکە باوکم بە پێچەوانەی دایکمەوە دژی ئەوە نەبوو ببم بە نووسەر، بەلای منەوە دانپێدانانی ئەو گرنگ بوو، نەک بەتەنها لەبەر ئەوەی متمانەم بە چێژ و زیرەکییەکەی هەبوو. لەو کاتەدا باوکم لەگەڵ ئێمەدا نەبوو، دوور بوو. بەبێسەبری چاوەڕێی گەڕانەوەیم کرد. دوای دوو هەفتە، کاتێک گەڕایەوە، بەخێرایی چووم دەرگاکەم لێ کردەوە. باوکم هیچ شتێکی نەوت، بەڵام بە شێوەیەکی وەها باوەشی پێدا کردم، یەکسەر تێگەیشتم کە

کتێبەکەمی زۆر بەدڵ بووە. بۆ ماوەیەک کەوتینە دۆخی جۆرە بێدەنگییەکەوە، کە لە ساتێکی عاتیفی قووڵدا دێتە مەیدانەوە. دواتر، کاتێک کەمێک ئاسوودە بووین، دەستمان کرد بە گفتوگۆ، باوکم بە جۆشێکی زۆر و زمانێکی پیاهەڵدانەوە متمانەی خۆی بۆ من، یاخود یەکەم کتێبم دەر بڕی، پێی وتم کە ڕۆژێک ئەم خەڵاتە بەدەست دەهێنم، کە ئەمڕۆ بە دڵخۆشییەکی گەورەوە پەسەندی دەکەم.

باوکم بەدەر لە باوەڕی بە خەڵاتەکە، یاخود بیەوێت وەک ئامانجێک پیشانی بدات، وەک باوکێکی تورک ئەم قسەیەی کردبوو، کە بۆ ئەوەی یارمەتیی کوڕەکەی بدات و بەجەرگی بکات، بە کوڕەکەی دەڵێت، "ڕۆژێک دەبیت بە جەنەڕاڵ!" بە درێژاییی چەندەها ساڵیش، هەموو جارێک کە دەیبینیم، بۆ ئەوەی بەجەرگترم بکات، ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە.

باوکم لە ٢٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢دا کۆچی دوایی کرد. ئەندامە بەڕێزەکانی ئەکادیمیای سوید، کە ئەم خەڵاتە گەورەیە و ئەم شەرەفەم پێ دەبەخشن، میوانە بەڕێزەکان، لەڕادەبەدەر دەموسیت ئەمڕۆ باوکم لەنێوانماندا بێت.

کانوونی یەکەم ٢٠٠٦، ستۆکهۆڵم
وتاری پاموک پێش وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل.

# ئەو نووسەرەی ئاماژەی بۆ دەکرێت

سی ساڵە دەنووسم، زەمەنێکی زۆریشە ئەم قسەیە دووبارە دەکەمەوە. ئەوەندە ئەم قسەیەم دووبارە کردۆتەوە، لە ڕاستی دەر چووە، چونکە چووینە ناو سییەک ساڵەوە. بەلام دووبارە شتێکی خۆشە کاتێک دەڵێم سی ساڵە ڕۆمان دەنووسم. بەڵێ، ئەمەش ڕێک ڕاست نییە. جارجارێک شتی تریش دەنووسم، وەک ئەزموون و ڕەخنە، چەند شتێک لەسەر ئیستانبوڵ یاخود سیاسەت، یاخود وتار دەنووسم بۆ کۆبوونەوەی لەم شێوەیە... بەلام پیشە بنچینەییەکەم، ئەو شتەی دەمبەستێتەوە بە ژیانەوە، نووسینی ڕۆمانە... زۆر نووسەری درەوشاوەش هەن کە نیوسەدەیە دەنووسن، ئەمە ماوەیەکی زۆر زیاترە لەوەی من، بەلام زۆریش سەرنجیان ڕانەکێشاوە بۆ ئەم خاڵە... نووسەرەکانی وەک تۆلستۆی، دۆستۆیفسکی یاخود تۆماس مانیش، کە زۆر کەیفم پێیان دێ و تا ئێستاش بەشەیداییەوە دەیانخوێنمەوە، زیاتر لە پەنجا ساڵ چالاکانە لەسەر نووسین بەردەوام بوون، نەک سی ساڵ... ئەو کات بۆچی من باس لە سی ساڵ دەکەم؟ لەبەر ئەوەی دەمەوێت باس لە نووسەربوون و ڕۆماننووسی

بکەم، وەک بڵێی باس لە ڕاهاتنێک بکەم.

بۆ ئەوەی بتوانم دڵخۆش بم، پێویستە هەموو ڕۆژێک کەمێک سەرقاڵی ئەدەبیات بم. وەک هەندێک نەخۆش، کە پێویستە هەموو ڕۆژێک کەوچکێک لە دەرمانەکەی بخوات... لە سەردەمی منداڵیمدا کاتێک زانیم ئەوانەی نەخۆشیی شەکرەیانە دەبێت هەموو ڕۆژێک دەرزییەک لە خۆیان بدەن بۆ ئەوەی بتوانن وەک هەموو کەس بەردەوام بن لە ژیان، زۆر دڵتەنگ بووبووم بۆیان؛ بیرم لەوە کردبووەوە کە ئەم نەخۆشانە نیوەمردوون. لەم ڕوانگەیەوە، ئالوودەبوونم بە ئەدەبیاتەوە منیشی هێناوەتە باری "نیوەمردوو." بەتایبەتی کاتێک نووسەرێکی گەنج بووم، وام دەزانی ئەوانەی کە پێیان دەوتم "لە ژیان دابڕاویت،" ئاماژە بەو باری "نیوەمردوو"ە دەکەن. دەشتوانین بەمە بڵێین نیوەخێو. هەندێک جار بیرم لەوەش کردۆتەوە، بەڵکو مردووم و هەوڵ دەدەم تا بە ئەدەبیات جەستەکەی ناوم زیندوو بکەمەوە، بیگەڕێنمەوە ناو ژیان. ئەدەبیات بۆ من وەک دەرمان پێویستە. ئەو ئەدەبیاتەی کە پێویستە هەموو ڕۆژێک "بەکاری" بهێنم وەک دەرمانێک، کە بەکەوچک یاخود بە دەرزی بەکار دەهێنرێت، هەندێک تایبەتمەندی و خەستییەکی واتاداری هەیە، وەک کێشانی ئەسرار[١].

سەرەتا دەبێت "دەرمانەکە" باش بێت. بە بڕوای من، باش واتە ڕاستەقینە و بەهێز. ڕۆمانێکی بەهێز و چڕ و قووڵ کە بتوانم باوەڕم پێی هەبێت، لە هەموو شتێک زیاتر دڵخۆشم دەکات، دەمبەستێتەوە بە ژیانەوە. ڕۆمانێکیش هەڵدەبژێرم کە

١ ئەسرار: ماددەیەکی هۆشبەری ڕووەکییە.

نووسەرەکەی مردبێت. چونکە ئیرەییەکی بچووکیش هەیە تا نووسەرەکە چێژ لەو شەیداییەم نەبینێت کە لە ناخمەوە هەڵدەقوڵێت. تاکو تەمەنم بەرەو پێش بچێت، ئەوە دەبینم کە باشترین کتێب ئەو کتێبانەن کە نووسەرەکانیان مردوون. ئەگەر نەشمردبن، ئەوا ئەم نووسەرانە وەک خێوێک وان لەنێوانماندا. لەبەر ئەوە، کاتێک ئەوان لە کۆڵانەکاندا دەبینین، تووشی جۆشوخرۆش دەبین، باوەڕ بە چاومان ناکەین، وەک بڵێی خێوێکمان بینیبێت، بەمەراقەوە لە دوورەوە سەیریکیان دەکەین. کەم کەسی بەجەرگ هەیە ڕابکات بۆ لای ئەو خێوە و داوای واژۆی لێ بکات. هەندێک جار بیر لەوە دەکەمەوە کە دوای ماوەیەک ئەو نووسەرەش دەمرێت، بەو شێوەیەش کتێبەکانی لە دڵماندا، لە شوێنێکی بەرزتردا جێگیر دەبن. بەڵام بەدڵنیایی ئەمە هەمیشە بەو شێوەیە نییە...

ئەگەر خۆم ئەو "بڕە، ئەدەبیاتە" بنووسم کە پێویستە هەموو ڕۆژێک بەکاری بهێنم، شتێکی زۆر جیاوازترە. چونکە نووسینی نیوپەڕەی باش، باشترین چارەسەر و گەورەترین سەرچاوەی دڵخۆشییە بۆ ئەوانەی کە وەک منن. دەتوانم بڵێم سی ساڵە هەموو ڕۆژێک لە ژوورەکەمدا زیاتر لە دە کاتژمێر لەسەر مێزەکەم دادەنیشم و دەنووسم. ئەگەر بەراوردی ئەم سی ساڵە بکەیت لەگەڵ ئەو بڕەدا کە توانیومە تەواویان بکەم و بڵاوم کردوونەتەوە، ڕۆژی نزیکەی نیوپەڕە کەمتری بەر دەکەوێت. لەسەروو ئەوەشەوە، ئەگەرێکی گەورەی هەیە لەو ڕێژەیەش کەمتر بێت کە من پێی دەڵێم "باش." ئەمەش دوو هۆکاری گەورەیە بۆ ئەوەی نائاسوودە بیت.

بەڵام با بەهەڵە تێنەگەن: کەسێکی وەک من کە ئالوودەی

ئەدەبیات بێت، ئەوەندە ڕووکەش نییە کە بە جوانی و ژمارەی ئەو کتێبانەی نووسیونی، یاخود بە سەرکەوتنەکەی دڵخۆش ببێت. ئەو بەتەنها لەبەر ئەوە ئەدەبیاتی دەوێت تا ئەو ڕۆژە قورسەی پێ ڕزگار بکات کە تێیدا دەژی، نەک بۆ ئەوەی هەموو ژیانی ڕزگار بکات. هەمیشەش ڕۆژەکان قورسن. لەبەر ئەوەی نانووسن ژیان قورسە. لەبەر ئەوەی ناتوانن بنووسن ژیان قورسە. لەبەر ئەوەی دەشنووسن ژیان قورسە، چونکە نووسین زۆر قورسە. ئەگەر مەسەلەکە ئەوە بێت کە لەناو ئەم هەموو قورساییانەدا ئومێدێک بدۆزیتەوە تا بتوانیت ڕۆژەکەی پێ بەسەر بەریت، خۆ ئەگەر ئەو کتێب و پەڕانەش باش بن کە ئێوە دەبات بۆ دنیایەکی نوێ، ئیدی ئەمە واتای ئەوەیە ئەو ڕۆژە ئاسوودە و دڵخۆشیت.

با باسی ئەوە بکەم، ئەگەر ڕۆژێک بەباشی نەمنووسیبێت، لەناو کتێبێکدا کە دەبێتە هۆی دڵدانەوەم خۆمم ون نەکردبێت، هەست بە چی دەکەم. لە ماوەیەکی کورتدا دنیا لە بەرچاومدا دەبێت بە شوێنێکی خراپ و وێران کە بەرگە ناگیرێت؛ ئەوانەی دەمناسن، تێدەگەن کە منیش لەو دنیایە دەچم. بۆ نموونە کچەکەم، شەو بە ڕوخسارە نائومێدەکەمدا یەکسەر تێدەگات کە ئەو ڕۆژە نەمتوانیوە بەباشی بنووسم. دەمەوێت ئەمە لەو بشارمەوە، بەڵام ناتوانم. لەم ساتە خراپانەدا بیر لەوە دەکەمەوە کە "ژیان و مردنیش یەک شتە." نامەوێت قسە لەگەڵ کەسدا بکەم، کەسیش نایەوێت قسەم لەگەڵدا بکات کاتێک لەم حاڵەدا دەمبینن. لە ڕاستیدا دوانیوەڕۆی هەموو ڕۆژێک، لەنێوان کاتژمێر یەک بۆ کاتژمێر سێ، شتێکی لەم شێوەیە کەمێک دەنیشێتە سەر ڕۆحم، بەڵام وەک دەرمانێک

بەباشی فێری بەکارهێنانی نووسین و کتێبەکان بووم، پێش ئەوەی بەتەواوەتی بگەڕێمەوە ناو جەستەم، خۆم لەو دۆخە ڕزگار دەکەم. ئەگەر بە هۆی گەشتەوە بۆ ماوەیەکی درێژ کاغەز و دەرمانە بۆنمەرەکەبەکەم بەکار نەهێنابێت، یاخود وەک سەردەمی کۆن بە هۆی سەربازی، پێدانی پارەی پسوولەی غاز، لە ئێستاشدا بە هۆی دەردە سیاسییەکان و کێ دەزانێت بە هۆی کام بەربەستەوە، ئەگەر نەتوانم ئەم دەرمانە بەکار بهێنم، هەست دەکەم بە هۆی نائاسوودەییەوە بووم بە جۆرە پیاوێکی چیمەنتۆئاسا. چەپ و ڕاستی جەستەم بەباشی کار ناکەن، جومگەکانم ناسووڕێن، سەرم دەبێت بە بەرد، وەک بڵێی ئارەقەکەشم بۆنێکی تری لێ دێت. پێدەچێت ئەم نائاسوودەییە زیاتریش بخایەنێت: ژیان پڕە لەو سزایانەی کە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە دڵدانەوەی بە ئەدەبیات. لە کاتی ئامادەبوون لە کۆبوونەوەیەکی جەنجاڵی سیاسیدا، چەنەبازیکردن لەگەڵ هاوڕێکانمدا لە ڕاڕەوەکانی قوتابخانەدا، کۆبوونەوە لەگەڵ خزمەکانمدا بۆ نانخواردنی جەژن، بەناچاری گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسێکی باشدا، کە مێشکی پڕە لە بابەتی نازانم چیی تەلەڤزیۆن و لە دنیایەکی تردایە، "چاوپێکەوتنێک لەبارەی ئیشەوە،" کە پێشتر پلانی بۆ دانراوە، بازاڕکردنێکی ئاسایی، چوون بۆ دادنووس، وێنەگرتن بۆ وەرگرتنی ڤیزە، ئیتر لەم کاتانەدا لەناکاو پێڵووی چاوەکانم قورس دەبن، لە ناوەڕاستی ڕۆژدا خەوم دێت. چونکە لەو کاتەدا ئەستەمە بگەڕێمەوە بۆ ژوورەکەم و بەتەنها بمێنمەوە، تاکە دڵنەواییم ئەوە بووە کە لە ناوەڕاستی ڕۆژدا لە شوێنی نامۆدا بخەوم.

بەڵێ، بەڵکو ئەدەبیات پێویستییە ڕاستەقینەکە نییە، پێویستییە ڕاستەقینەکە ئەوەیە لە ژوورێکدا بەتەنها بمێنمەوە و خەیاڵ بکەم. ئەو کات لەبارەی هەموو مرۆڤەکانی ناو شوێنە قەرەباڵغ، کۆبوونەوەی خێزان، قوتابخانە، یاخود نانخواردنی جەژنانەوە خەیاڵی زۆر جوان دەکەم. زیاتر بەوردی بیر لەو مرۆڤانە دەکەمەوە، زیاتر بە دڵخۆشیان دەزانم لە نانخواردنە قەرەباڵغەکانی جەژندا. هەموو شتێک لە خەیاڵمدا ڕاست و سەیر و سەرنجڕاکێش دەبێت. ئیتر لەناو ئەم دنیایەی کە دەیزانین، دەستم کردووە بە خەیاڵکردنەوە لە دنیایەکی نوێ. بەو شێوەیەش هاتینە سەر دڵی بابەتەکەمان. بۆ ئەوەی بتوانم باش بنووسم، دەبێت باش بێزار ببم؛ بۆ ئەوەی باشیش بێزار ببم، پێویستە بچمە ناو ژیانەوە. کاتێک لە ڕۆژێکی باراناویدا، ڕێک لەناو ئەو ژاوەژاو، گرمەگرم، نووسینگە، تەلەفۆن، عەشق، هاوڕێیەتی و کەناردەریایەکی خۆرهەتاو و ڕێوڕەسمی جەنازەیەکدا دەبم، واتە کاتێک لەوەدام بچمە ناو دڵی ئەم ناوەندانەوە، لەناکاو هەست دەکەم کە لە ڕاستیدا لە کەناردام. دەست دەکەم بە خەیاڵدروستکردن. ئەگەر ڕەشبین بن، دەتوانن بیر لەوە بکەنەوە کە بێزار بوون. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا دەنگێک لە ناختدا هەیە کە دەڵێت، "بگەڕێرەوە بۆ ژوورەکەت، لەسەر مێزەکەت دانیشە." ڕێگەی کەسانی تر نازانم، بەڵام کەسانی وەک من بەم شێوەیە دەبن بە نووسەر. هەستیش دەکەم کە ئەم ڕێگەیە، ڕێگەی نووسینی سادە، چیرۆک -ڕۆمانە، نەک شیعر. ئەمەش کەمێک زیاتر زانیاریم دەداتێ لەبارەی تایبەتمەندیی ئەو دەرمانەی کە پێویستە هەموو ڕۆژێک

بەکاری بهێنم. بە هۆی هێزی دەرمانەکەوە تێدەگەین کەسەکە زۆر بەباشی سوودی هەم لە ژیان، هەم لە هێزی خەیاڵی وەر گرتووە.

ئەم لۆژیکەی بە چێژی دانپێدانان و ترسی وتنی ڕاستییەکان لەبارەی خۆمەوە پەیڕەوی دەکەم، ئەنجامێکی گرنگ و جیددیی هەیە، با یەکسەر بچمە ناو ئەم باسەوە. چەمکی ڕۆمانێکی کورت، کە نووسین وەک "دەرمانێک،" وەک دڵدانەوەیەک دیاری دەکات: هەندێک ڕۆماننووسی وەک من بابەتەکانی ناو ڕۆمانەکانیان بەگوێرەی پێویستی ئەم خەیاڵە ڕۆژانەیە هەڵدەبژێرن. هەمووومان ئەوە دەزانین کە ڕۆمانێک بە ویست، بیرکردنەوەیەکی زۆر، بە جۆش و تووڕەیییەوە دەنووسرێت. چێژی ئەوەی خۆشەویستەکەمان بەدڵی بێت، کەمنرخاندنی ئەو کەسەی کە لێی تووڕەین، باسکردن لە شتێک کە زۆر حەزمان لێیە، هەڵسوکەوتکردن بە شێوەیەک، وەک بڵێی لەبارەی شتێکەوە زانیاریت هەیە کە نایزانیت، خوێندنەوەت و خۆشویستنت لەلایەن کەسانی ترەوە، بابەتی سیاسی، مەراقە تایبەتەکان، خووە شەخسییەکان و چەندەها هۆکاری نادیاری تری وەک ئەمانە یاخود ناماقوڵ، بەنهێنی یاخود بەئاشکرا ئاراستە دەدەن بە ئێمە... هەمیشە ئەو خەیاڵانە هەن کە دەمانەوێت بەم هەستانە باسیان لێوە بکەین. بەتەواوەتی نازانین ئەو هەست و خەیاڵانە چین کە ئێمە دەخەنە جووڵە، بەڵام دەمانەوێت لە کاتی نووسیندا بمانخەنە جووڵە، ڕێک وەک ڕەشابایەک کە نازانیت لەکوێوە هاتووە. تەنانەت وەک کەشتیوانێک کە نازانێت بۆ کوێ دەچێت، کەمێک تەسلیمی ئەم هەستە تاریکانە دەبین... بەڵام

لە گۆشەیەکی مێشکماندا هەر دەزانین کە لە نەخشەکەدا لەکوێداین و دەمانەوێت بگەینە کوێ. تەناتەت بە بەراورد لەگەڵ ئەو نووسەرانەی دەیانناسم و شەیدایانم، کاتێک زۆر خۆم دەدەم بەدەم ڕەشەباشەوە، دەزانم بەرەو کوێ دەچم. پێشتر پلان دادەنێم، ئەو چیرۆکە بەشبەش دەکەم کە دەمەوێت بیگێڕمەوە، پێش ئەوەی بکەومە ڕێ، بەشبەبەش حسابی بۆ دەکەم، لە نەخشەکەدا دیاریی دەکەم کە کەشتییەکە دەچێت بۆ کام بەندەر، چ بارێک دادەگرێت، پێویستە چ بارێک هەڵبگرێت، ئەم گەشتە چەندی کات دەوێت. بەڵام ئەگەر چارۆکەکانم بە ڕەشەبایەک بئاوسێن کە لە شوێنێکی چاوەڕواننەکراوەوە دێت، بەرهەڵستی ناکەم لەوەی کە چیرۆکەکەم ئاراستە بگۆڕێت. لە ڕاستیدا ئەو شتەی کە کەشتییە چارۆکە ئاوساوەکە بۆی دەگەڕێت و لە بەرەوپێشچووندایە، هەستی پڕی و کامڵییە. وەک بڵێی بگەڕێم بۆ ئەو کات و شوێنە تایبەتەی کە هەموو شتێک تێیدا بەر یەک دەکەون و لەگەڵ یەکدا پەیوەندییان هەیە و هەواڵی یەکتری دەزانن. لەو کاتەدا ڕەشەباکە بەهێواشی نامێنێت، ئەم جارەیان لە شوێنێکدا خۆم دەبینمەوە کە بەتەواوەتی وەستاوە و بێجووڵەیە. هەست دەکەم لەناو ئەم ئاوە تەماوییە وەستاوەشدا چەند شتێک هەیە کە ببێتە هۆی ئەوەی ڕۆمانەکەم بەهێواشی پێش بکەوێت... هەمیشە منیش دەمەوێت ئەو شتانەم بەسەردا بێت کە لە ڕۆمانی *بەفر*دا باسم لێوە کردوون لەبارەی ئیلهامی شیعرییەوە. ئەمە شێوە ئیلهامێکە کە کۆلریدج باسی لێوە کردووە، کاتێک شیعرەکەی بە ناوی "کوبلە خان"ەوە (کوبیلای خان) نووسیوە، چۆن

هەستی پێ کردووە و ئەزموونی کردووە... منیش دەمەوێت بە ئیلهام هەندێک بار و برگەی (وەک ئەو ئیلهامی شیعرەی کۆلریدج یاخود (کا)، کە قارەمانی ناو ڕۆمانی *بەفرمە*) ڕۆمانم بە شێوەیەکی دراماتیککراو بۆ بێت، تا بینووسم. ئەگەر بەسەبر و وریاییەوە چاوەڕێ بکەم، ئەمەش دەبێت. ڕۆماننووسین ئاگاداربوونە لەو هەستانەی باسم لێوە کرد، لە ڕەشەبا، ساتەکانی ئیلهام، شوێنە تاریکەکانی ناو ئەقڵ و کاتە وەستاوە تەماوییەکان.

ڕۆمانیش چیرۆکێکە کە هەموو ئەم ڕەشەبایانە پەسەند دەکات، وەڵامی ئیلهامی جۆراوجۆر دەداتەوە و بە شێوەیەکی واتادار هەموو ئەو خەیاڵانە یەک دەخات کە دەمانەوێت دروستی بکەین و سەرقاڵی ببین. بەڵام گرنگترینیشیان ئەمەیە: ڕۆمان جۆرە سەبەتەیەکە کە دنیایەکی خەیاڵی هەڵگرتووە، بەردەوام دەمانەوێت بەزیندوویی ڕای بگرین و ئامادە بێت. ڕۆمانەکان ئەو پارچەخەیاڵانە یەک دەخەن کە دەمانەوێت بچینە ناوی و یارمەتیمان بدەن چی زووترە دنیا بێزارکەرەکەمان بیر بەرنەوە. بە "نووسینی بەردەوام" ئەم خەیاڵانە فراوان دەکەین، ئەم دووەم دنیایە دەهێنینە بارێکی زیاتر فراوان، زیاتر کامڵ و پڕ لە وردەکاری. تاکو بنووسین، بەم دنیا نوێیە ئاشنا دەبین، تاکو پێی ئاشنا بین، لە ئەقڵماندا هەڵگرتنی ئاسانتر دەبێت. ئەگەر لە ناوەڕاستی ڕۆمانێکدا بم و بەباشی بینووسم، دەتوانم بەئاسانی بچمە نێوان خەیاڵەکانی ئەم دووەم دنیایەوە. ڕۆمانەکان دنیایەکی نوێن، کاتێک دەخوێنرێنەوە، یاخود بەزۆری کاتێک دەنووسرێنەوە، بەدڵخۆشییەوە دەچینە ناویان: بارێکیان وەر گرتووە بۆ

ئەوەی بەئاسانی ئەو خەیاڵانە هەڵبگرن کە ڕۆماننووسەکان دەیانەوێت دروستی بکەن. وەک ئەو دڵخۆشییەی کە دەیدەن بە خوێنەری باش، دنیایەکی نوێی بەمتمانە و پتەویش دەبەخشن بە نووسەرە باشەکان، کە لە هەر کاتێکی ڕۆژدا رابکەنە ناوی، دڵخۆش ببن تێیدا. ئەگەر توانیبێتم، کەمێکیش بێت، دنیایەکی ئەوەندە ناوازەم دروست کردبێت، ئەو کات هەر کە نزیک دەبمەوە لە مێزی کارکردنەکەم و کاغەزە نووسراوەکانم، هەست بە دڵخۆشیی خۆم دەکەم. ڕۆیشتنم لەم دنیا ئاسایی و سادەیەی کە پێی ئاشنایین بەرەو دنیا فراوان و ئازادەکەی تر، پەیوەندیی بە ساتەوە هەیە، زۆربەی کاتیش لە ناخەوە نامەوێت بگەڕێمەوە، ناشمەوێت ئەم دنیای دووەمە تەواو بکەم، کە تا دەڕوات فراوان دەبێت، ناشمەوێت بێمە کۆتاییی ڕۆمانەکە. ئەم هەستەم هەمەئاهەنگە لەگەڵ ئەم داخوازییەی خوێنەرێکی باشدا، کە دەزانێت لە نووسینەوەی ڕۆمانێکی نوێدام: "تکاتان لێ دەکەم با ئەم ڕۆمانەتان زۆر درێژ بێت!" کاتێک گوێم لەم قسەیە دەبێت، هەزار جار زیاتر شانازی دەکەم وەک لە قسە و ئاواتی بڵاوکەرەوە خراپەکان کە دەڵێن، "ڕۆمانەکەتان با کورت بێت!"

بەرهەمەکانی مرۆڤێک لەبارەی حەز و دڵخۆشیی شەخسیی خۆیەوە، چۆن ئەوەندە سەرنجی کەسانێکی زۆر ڕادەکێشێت؟ ئەوانەی کە *من ناوم سوورە*یان خوێندۆتەوە، بیری قسەکەی شەکورەیان دەکەوێتەوە، لە کۆتاییی ڕۆمانەکەدا، لەبارەی ئەوەی کە هەوڵدان بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو شتێک جۆرە گەمژەیییەکە. تێڕوانینی منیش لەم بابەتەدا لە شەکورەوە نزیکە، نەک لە ئۆرهانە قارەمانە

بچووکەکەی لەویدا دایکی کەمێک لە ئاستی دادەبەزێنێت.
بەڵام بە مۆڵەتی ئێوە دووبارە با گەمژەییەک بکەم، وەک ئۆرهان هەڵسوکەوت بکەم، با ڕوونی بکەمەوە بۆچی ئەو خەیاڵانەی کە دەرمانی نووسەرن دەبن بە دەرمانی کەسانی تریش: چونکە ئەگەر بەتەواوەتی لەناو ڕۆمانەکەدا بم و باش بینووسم، واتە ئەگەر دوور کەوتبێتمەوە لە بێزاریی ژیانی ڕۆژانە، زرەزرِی تەلەفۆن، پرسیارەکان و داواکارییەکان، ئەو یاسا ئازاد و بەهەشتییەی لەگەڵ ڕۆمانەکەمدا پێی گەیشتووم، یارییەکانی سەردەمی منداڵیم دێنێتەوە یاد. وەک بڵێی هەموو شتێک ئاسان بووە، لەناو ئەم ئاسانییەدا دەستی کردووە بەوەی نهێنییەکانیم بداتێ، وەک ئەو ماڵ، ئۆتومبێل و کەشتییانەی لە شووشە دروست کراون و ناوەوەی خۆیان پیشان دەدەن. کارم ئەوەیە هەست بەم یاسایانە بکەم و تۆماریان بکەم؛ بەچێژەوە سەیری ناو ماڵەکان بکەم، لەگەڵ قارەمانەکانمدا سواری پاس و ئۆتومبێلەکان ببم و لە ئیستانبوڵدا بگەڕێم؛ لەو شوێنەدا کە بێزار دەبم، یەکسەر بە هەست ئەو شتانە بگۆڕم کە بینیومن: ڕابواردن و نابەرپرسیاری؛ وەک چۆن لەبارەی منداڵانیشەوە دەوترێت، کاتێک ڕادەبوێریت، شتیش فێر دەبیت. ئەگەر نووسەرێکی داهێنەر بیت، ئەو کات جوانترین لایەنی نووسەربوون ئەوەیە کە بتوانیت وەک منداڵێک دنیا لەبیر بکەیت، کاتێک بە دڵی خۆت یاری دەکەیت، ڕادەبوێریت، هەست بکەیت کە بەرپرسیار نیت، وەک بڵێی لەگەڵ یاریچەکاندا یاری بکەیت، یاری بە یاساکانی ئەو دنیایە بکەیت کە دەیزانین، کاتێک ئەمانەش دەکەیت، لە سووچێکی مێشکتاندا بە هەموو

لایەنەکانیەوە هەست بە بوونی بەرپرسیاریتییەکی قووڵ بکەیت لەپشت ئەم ئاسوودەییە منداڵئاسا و ئازادەوە، کە دواتر خوێنەرەکانی دەبەستێتەوە. بە درێژاییی هەموو ڕۆژ یاری دەکەن، بەڵام هەستیش دەکەن کە لە ناخەوە لە هەموو کەسێک زیاتر جیددین. بەتەنها لە ناخەوە، بە جیددیەتێکی منداڵئاسا هێزی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕاستەوخۆی کرۆکی ژیانتان هەڵگرتووە. تاکو بەبەجەرگی یاسا زیاد بکەن بۆ ئەو یاسایانەی بەئازادی دروستتان کردووە و یاریی پێ دەکەن، هەست دەکەن کە خوێنەرەکانیش دەکەونە ناو هێزی ڕاکێشانی چیرۆک، زمان و ڕستەکانی ئەم یاسایانەوە و شوێنتان دەکەون. نووسەربوون ئەو هونەرەیە کە بتوانێت خوێنەرەکەی بهێنێتە بارێک کە بڵێت، "منیش ڕێک ئەمەم دەوت، بەڵام نەمتوانی ئەوەندە منداڵئاسا بم."

هەندێک جار ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ سادەییی منداڵئاسای ئەم دنیایە، کە بە خەیاڵدروستکردن، بە هەڵدانی چارۆکە بەرەو ڕەشەبایەکی ناوەخت و بە سەیرکردنی نەخشەکە دۆزیومەتەوە و گەشەم پێ داوە. ئەمە بەسەر هەموو نووسەرێکدا دێت. واتە هەندێک جار لە شوێنێکدا دەمێنێتەوە، یاخود دوای ماوەیەک ناتوانم بەردەوام بم لە ڕۆمانەکە، لەو شوێنەدا کە تێیدا وەستاوم. لەم جۆرە دۆخانەدا کە زۆر دەبینرێت، بەڵکو کەمتر ناڕەحەتی دەچێژم بە بەراورد لەگەڵ نووسەرەکانی تردا؛ چونکە دەتوانم لە کونێکی تریشەوە بچمەوە ناو چیرۆکەکەم، نەک لەو شوێنەوەی کە تێیدا وەستاوم، لەبەر ئەوەی بەباشی سەیری نەخشەکەم دەکەم، دەتوانم لە بەشێکی تری ڕۆمانەکەوە دەست پێ بکەمەوە.

ئەمە زۆر گرنگ نییە. بەڵام کاتێک سەرقاڵی هەندێک دەردی سیاسی بووم کە ئەمساڵ بەسەرم هاتن، دووبارە ڕووبەڕووی هەمان نارەحەتی بوومەوە، هەستم کرد کە شتێکم لەبارەی ڕۆماننووسینەوە ئاشکرا کردووە. هەوڵ دەدەم ڕوونی بکەمەوە.

سکاڵایەکی سیاسیم لەسەر تۆمار کرابوو، ئەو دۆخە سیاسییەی کە کەوتمە ناوی، منی هێنابووە بارێکی زیاتر "سیاسی، جیددی و بەرپرسیار" وەک لەوەی کە دەموسیت. دۆخێکی خەمهێن بوو، با بەپێکەنینەوە بڵێم کە زیاتر دۆخێکی ڕۆحیی خەمهێن بوو. لەبەر ئەوە نەمدەتوانی سادەیی منداڵئاسای پێویست بدۆزمەوە تا ڕۆمان بنووسم... کاتێک کێشەکان بەهێواشی تێپەڕین و ڕۆیشتن، بیرم لەوە دەکردەوە کە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو "نابەرپرسیارێتییەی" کە بۆ ماوەیەکی کاتی لەدەستم دابوو، دەست دەکەمەوە بە یاریکردنە منداڵئاسا و گاڵتەپێکردنەکانم، ڕۆمانەکەشم تەواو دەکەم کە سێ ساڵە کاری تێدا دەکەم. بەڵام دووبارە هەموو بەیانییەک، پێش ئەوەی شارەکەم، ئیستانبوڵە دە میلیۆنییەکە لە خەو هەڵسن، لەسەر مێزەکەم دادەنیشتم، پاشان لە بێدەنگیی کۆتاییی شەودا سەرلەنوێ هەوڵم دەدا لەو شوێنەوە دەست بکەمەوە بە نووسینی ڕۆمانەکە کە تێیدا وەستابووم. بۆ ئەم مەبەستەش خۆمم هیلاک دەکرد، هەوڵم دەدا بچمەوە ئەو دووەم دنیایەی کە خۆشم دەوێت. دوای ئەم هەوڵە زۆرانە، دەمبینی کە بە بەرچاومدا پارچەکانی ڕۆمانێک دێن و دەچن کە دەمەوێت بینووسم... بەڵام پارچەکانی ئەو ڕۆمانە نا کە لە نووسینەوەیدا بووم، ئەمانە چەند برگەیەکی

زۆر جیاوازی ڕۆمانێکی تر بوون. لەو ڕۆژە ناخۆش و بێنەشئانەدا، هەموو بەیانییەک تا دەڕۆی برگە، ڕستە، فیگەر و وردەکاریی سەیرم لەبارەی ڕۆمانەکەی ترەوە بۆ دەهات... دوای ماوەیەک، لە دەفتەرێکدا دەستم کرد بە نووسینەوەی پارچەکانی ئەم ڕۆمانە جیاوازە، هەموو ئەو وردەکارییانەم وەک تێبینی نووسی کە پێشتر هەر لە مێشکمدا نەبوون. ئەم ڕۆمانە لەبارەی وێنەکێشێکی هاوچەرخەوە بوو کە مردبوو... هێندەی ئەو بیرکردنەوانەی لەبارەی وێنەکێشە مردووەکەوە دەهات بە مێشکمدا، لەبارەی ئەو وێنانەشەوە کە ئەو کێشابوونی بیرۆکە دەهاتە مێشکمەوە. دوای ماوەیەک تێگەیشتم کە لەو ڕۆژە ناخۆشانەدا نەمتوانیوە بگەڕێمەوە بۆ نابەرپرسیارێتییەکی منداڵئاسا. تەنها دەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ ڕۆژانی سەردەمی منداڵیم، کە بەردەوام وێنەم دەکێشا و بیرم لەوە کردبووەوە ببم بە وێنەکێش (وەک لە کتێبی *ئیستانبول*دا باسم کردووە)، نەک منداڵئاسا. دواتر ئەو سکاڵا سیاسییەی لەسەرم تۆمار کرابوو کۆتایی هات، گەڕامەوە بۆ نووسینەوەی ئەو ڕۆمانەی کە لە نووسینەوەیدا بووم بە ناوی *مۆزەخانەی پاکیزەییەوە*. ئەمڕۆ بیر لەوە دەکەمەوە، ڕۆژێک ئەو ڕۆمانە بنووسم کە لەو ڕۆژانەی نەمدەتوانی بگەڕێمەوە دۆخی منداڵئاسا و تەنها دەمتوانی بگەڕێمەوە ناو هەستەکانی سەردەمی منداڵیم و یەک-یەک برگەکانی دەهاتن بە مێشکمدا. بەڵام لەم ئەزموونەوە، لەبارەی ڕەهەندی ڕۆحیی ڕۆماننووسینەوە یەک زانیاری لام ماوەتەوە.

دەتوانم ئەمە بە گۆڕینی چەمکی وۆلفگەن ئایزەری ڕەخنەگر و ڕامیاریزان کە دەڵێت، "ئەو خوێنەرەی ئاماژەی

بۆ دەکرێت،" چۆن بمەوێت بەخراپی بەکاری بهێنم، زۆر باش تێبگەیەنم. ئایزەر گەشەی بە چەمکی درەوشاوەی ئەدەبیات کردبوو بە ئاراستەی خوێنەر. وتوویەتی واتای ڕۆمانێک کە دەیخوێنینەوە، نە بەگشتی لەناو بڕگەکانیداتە، نە لەو کەشەدایە کە ڕۆمانەکەی تێدا نووسراوە، بەڵکو لەنێوان هەردووکیاندایە. بەگوێرەی ئایزەر، کاتێک کتێبێک دەخوێنرێتەوە واتاکەی دەر دەکەوێت، دەشڵێت، "ئەو خوێنەرەی کە کتێب ئاماژەی بۆ دەکات،" مەبەستی ئەو کارە تایبەتەی خوێنەرە.

کاتێک خەیاڵم لە بڕگە، ڕستە و وردەکارییەکانی کتێبێکی جیاواز دەکردەوە لە جێگەی ئەو کتێبەی کە دەمویست بینووسم، ئیتر ئەم چەمکەم بیر کەوتەوە، بیرم لەوە کردەوە هەموو ئەو کتێبانەی کە پلانیان بۆ دانراوە و خەیاڵیان لێ کراوەتەوە، بەڵام هێشتا نەنووسراون، نووسەرێک هەیە کە ئاماژەی بۆ بکەن (واتە ئەو کتێبەی کە من لە نیوەیدا مابوومەوە). ئەگەر ببین بەو نووسەرەی کتێبەکە ئاماژەی بۆ دەکات، پاشان دەتوانین کتێبەکە تەواو بکەین! بەڵام لەنێوان دەردە سیاسییەکاندا، یاخود لەناو ژیانی ڕۆژانە، جەڕەسی تەلەفۆن، قەرەباڵغیی ڕێگەی هاتوچۆ و کۆبوونەوە خێزانییەکاندا دەکەومە نارەحەتییەوە بۆ ئەوەی ببم بەو نووسەرەی ئەو کتێبە ئاماژەی بۆ دەکات و من خەیاڵم لێ کردۆتەوە بینووسم. لەو ڕۆژانەشدا کە سەرقاڵی کێشە سیاسییە نارەحەتەکان بووم، نەمدەتوانی ببم بەو نووسەرەی ئەو کتێبە ناوازەیە ئاماژەی بۆ دەکات کە لە نووسینەویدا بووم. دواتر ئەو ڕۆژانە تێپەڕین، وەک دەمویست، گەڕامەوە

سەر ڕۆمانەکەم، ئاسوودەش دەبووم بە بیرکردنەوە لەوەی کە لە ماوەیەکی کورتدا تەواوی دەکەم (بابەتەکە چیرۆکی عەشقێکە لەنێوان سالّی ١٩٧٥ و ڕۆژانی ئەمڕۆماندا، لەناو دەولّەمەنداکانی ئیستانبولّدا ڕووی داوە، کە ڕۆژنامەنووسەکان پێی دەڵێت سۆسیێتەکانی ئیستانبول...). بەلاّم دوای ئەم هەموو ئەزموونانە، تێگەیشتم لە ڕاستیدا سێ ساڵە هەموو هێزم بۆ ئەوە بەکار هێناوە کە ببم بەو نووسەرەی ئەو کتێبانە ئاماژەی بۆ دەکەن و دەمەوێت بیاننووسم. پێدەچێت ئەمە گرنگ بێت بۆ من، لەبەر ئەوەی هەمیشە بەهێواشی ویستوومە کتێبی قەبارەگەورە و بانگەشەکەر بنووسم. خەیاڵکردنەوە لە کتێبێک شتێکی قورس نییە. ئەمە بەچڕی دەکەم، ڕێک وەک خەیاڵکردنەوەم لەوەی کە ببم بە کەسێکی تر. ئەوەی کە قورسە، ئەوەیە ببیت بەو نووسەرەی کە ئەو کتێبە ئاماژەی بۆ دەکات و خەیاڵتان لێ کردۆتەوە.

بەلاّم با سکالاّ نەکەم. بەگوێرەی ئەوەی تاکو ئێستا حەوت ڕۆمانم نووسیوە و بلاّوم کردوونەتەوە، ئەگەر زۆریشم لە خۆم کردبێت، پێدەچێت نووسەرێک بم بتوانم ئەو ڕۆمانە بنووسم کە بیرم لێ کردۆتەوە. ئێستا دەزانم وەک ئەو کتێبانەی کە نووسیومن و لەدواوە ماونەتەوە، هەندێک لەو نووسەرە تارماییئاسایانەشم لەدوامەوە جێ هێشتووە کە توانیویانە ئەم کتێبانە بنووسن. ئەو حەوت "نووسەرەی کە ئاماژەیان بۆ کراوە،" هەریەکەیان لە من دەچێت، لە ماوەی سێ ساڵدا بەپێی زانیاری و باوەڕی خۆیان، بە هەموو بەرپرسیاریتی و جیددییەتی ئەو منداڵانەی کە یاری دەکەن، باسیان لەوە کردووە کە دنیا، ژیان لە ئیستانبوڵەوە و لە

شـوێنێکی هاوشـێوەی شـوێنەکەی منـەوە چۆن دەبینرێت.
زۆر ئارەزوو دەکەم بتوانـم کە سـی ساڵی تریش ڕۆمـان بنووسـم، بـە هـۆی ئـەم بیانووەشـەوە بچمـە نـاو بەرگـی چەندەهـا شووناسـی دیکـەوە و بژیـم.

ئۆکلاهاما، نیسانی ٢٠٠٦
وتاری پاموک لە کۆنفرانسی پەتەربوگ، لە زانکۆی ئۆکلاهاما.

# لە قارس و فرانکفۆرت

چوون بۆ فرانکفۆرت و مانەوە تێیدا چیژێکی گەورەیە، چونکە (کا)ی قارەمانی یەکێک لە ڕۆمانەکانم، کە بە ناوی بەفرەوەیە، دوایین پانزە ساڵی ژیانی تێدا بەسەر بردووە. قارەمانەکەم تورکە، لەگەڵ کافکادا خزمایەتییەکی ئەدەبییان هەیە، نەک خزمایەتییەک لە خوێنەوە. کەمێکی تر دێمە سەر خزمایەتیی ئەدەبی. ناوی ڕاستەقینەی (کا)کەی من کەریم ئالاکوشئۆغلووە؛ لەبەر ئەوەی حەزی لە ناوەکەی نەبووە، کورتکراوەی ناوەکەی هەڵبژاردووە. وەک دوورخراوەیەکی سیاسی، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠دا هاتووە بۆ فرانکفۆرت. کەسێکی ئەوەندەش بەمەراق نییە بۆ سیاسەت، تەنانەت سیاسەتی خۆش ناوێت: ئەقڵ و هۆشی لای شیعرە. قارەمانەکەم شاعیرێکە، کە لە فرانکفۆرت دەژی. بەبێ ویستی خۆی سیاسەت وەک ڕووداوێک لە تورکیا ئێخەی گرتووە. ئەگەر کاتم بەش بکات، ئەمڕۆ دەمەوێت وەک ڕووداو یەک-دوو شت لەبارەی سیاسەتەوە بڵێم. زۆر قسە هەیە بکرێت، بەڵام خەمتان نەبێت: ڕۆمانەکانم درێژن، بەڵام قسەکانم کورتن.

پێنج ساڵ پێش ئێستا، لە ساڵی ٢٠٠٠دا، بۆ ئەوەی هیچ

نەبێت بتوانم لە ڕۆمانەکەمدا بەبێ هەڵە باسی فرانکفۆرتی سالانی ۱۹۸۰-۱۹۹۰ بکەم، هاتم بۆ فرانکفۆرت، کە (کا) دوایین ساڵەکانی ژیانی تێدا بەسەر بردووە. ئەو دەمە دوو کەس زۆر جوامێرانە یارمەتییان دام، کە ئەمڕۆ لەناو ئەم قەرەباڵغییەدان، لە سایەی ئەوانەوە چووین بۆ باخە بچووکەکەی نزیک گوتلۆیدستراسەی پشتی بینا کۆنەکانی کارگەکان، کە قارەمانەکەم دوایین پانزە ساڵی ژیانی لێ بەسەر بردبوو. دواتر، بۆ ئەوەی بتوانم بیر بکەمەوە کە (کا) چۆن هەموو بەیانییەک لە ماڵەکەی خۆیەوە ڕێی کردووە بۆ ئەو کتێبخانەیەی شارەوانی، کە ڕۆژانە چەندەها کاتژمێری تێدا بەسەر بردووە، لە مەیدانی وێستگەکەوە، کایسەرستراس، لە بەردەمی دوکانەکانی بابەتە سێکسییەکان، ئەنەرستراسەی میونیخ، دوکانی میوەفرۆشە تورکەکان، کەبابچییەکان و دوکانی دەلاکەکانەوە تا دەگاتە مەیدانی هاوپتواخێ ڕێمان کرد، تەنانەت بە بەردەمی ئەم کڵێسایەشدا ڕێمان کرد کە ئێستا لەناویداین. چووینە دوکانی کاوفهۆف، کە (کا) پاڵتۆکەی لێ کڕیبوو و چەندەها ساڵ بە شانازی و دڵخۆشییەوە لەبەری دەکرد. بۆ ماوەی دوو ڕۆژ گەڕاین، چووین بۆ ئەو مزگەوت، کەبابچی، ڕێکخراو و قاوەخانەی ئەو گەڕەکە کۆن و هەژارانەی کە تورکەکانی تێدا دەژین. ئەمە حەوتەم ڕۆمانم بوو، بەڵام بیرمە بە ڕێژەیەکی ناپێویست تێبینی وردم نووسیبوو، وەک ڕۆماننووسێکی نەشارەزای چاولێکەر، کە یەکەم ڕۆمانی دەنووسێت. بۆ نموونە، بڵێی لە ساڵی ۱۹۸۰کاندا ڕێگەیترامڤا لەم گۆشەیەوە تێپەڕیبێت...

هەمان شتم لە شاری قارسی باکووری ڕۆژهەڵاتی

تورکیاش کردبوو، کە بەشێکی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەمی تیدا ڕوو دەدات. بۆ ئەوەی ڕۆمانەکەم بنووسم، چەندەها جار چووم بۆ ئەم شارە، کە زۆر شارەزای نەبووم، بۆ ماوەیەک تێیدا مامەوە، لەگەڵ مرۆڤەکاندا یەکتریمان ناسی و هاوڕێیەتیم پێک هێنا، کۆلانبەکۆلان و دوکانبەدوکان شارەکە شارەزا بووم. چووم بۆ گەڕەکە دوورە لەبیرکراوەکانی ئەم شارە لەبیرکراوە، کە لە گۆشەیەکی دووری تورکیادا بوو، گفتوگۆم لەگەڵ ئەو بێکارانەدا کرد کە چایخانەکانیان پڕ کردۆتەوە و تەنانەت ئومێدی ئەوەشیان نییە کارێک بدۆزنەوە، گفتوگۆم لەگەڵ خوێندکارانی ئامادەیی و پۆلیسی مەدەنی، یاخود ئەو پۆلیسانەدا کرد کە پۆشاکی فەرمییان لەبەردا بوو و بەردەوام شوێنم دەکەوتن، هەروەها گفتوگۆم لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی ئەو ڕۆژنامانەشدا کرد کە فرۆشیان لە ٢٥٠ دانە زیاتر نەبوو.

بۆ ئەوە باس لەم شتانە ناکەم تا بیانکەم بە چیرۆکێک کە چۆن ڕۆمانی *بەفر*م نووسیوە، بۆ ئەوە باسیان دەکەم تا لەبارەی هونەری ڕۆمانەوە بچمە ناو بابەتێکەوە، کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر درکم پێ دەکرد: بابەتەکەمان گۆڕینی "ئەوی تر، نامۆ، دوژمن"ەکەی ناو سەرمانە. هەڵبەتە ڕۆمانەکان بۆ ئەوە دەنووسرێن کە باس لە مرۆڤەکان بکەن و خەیاڵ لەو مرۆڤانە بکەینەوە کە لە هاوشێوەی هەمان ئەو حاڵانەی ئێمەدان کە دەیزانین و کردوومانە بە دەرد بۆ خۆمان. سەرەتا دەمانەوێت ڕۆمانەکە باس لە کەسێک بکات کە لە ئێمە بچێت، تەنانەت باس لە خۆمان بکات بۆ خۆمان. باس لە دایکێک، باوکێک، خێزانێک، ماڵێک، کۆلانێک، شارێکی

ناسراو و وڵاتێک دەکەین، کە بەباشی دەیزانین و لەوانەی خۆمان دەچن. بەڵام یاسا سەیر و سیحراوییەکانی هونەری ڕۆمان لە ساتێکدا، خێزانەکەمان، ماڵەکەمان و شارەکەمان دەهێنێتە بارێک، کە هەموو کەس بە خێزان و ماڵ و شاری خۆی دەزانێت. زۆر وتراوە کە *بوودن برۆک* ڕۆمانێکی زیاد لە ڕێژە ئۆتۆبایۆگرافییە، بەڵام من لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا، کاتێک پەڕەکانی ئەم ڕۆمانەم دەخوێندەوە، وەک بڵێی چیرۆکی خێزانێک دەخوێنمەوە کە بەئاسانی بە خێزانەکەی خۆمم دەچوواند، نەک چیرۆکی خێزانی نووسەرەکە، کە هێندە نەمدەناسی. میکانیزمە ناوازەکانی هونەری ڕۆمان یارمەتیی ئەوەمان دەدات کە چیرۆکی خۆمان وەک چیرۆکی ئەوی تر پێشکەش بە هەموو دنیا بکەین.

بەڵێ، هونەری ڕۆمان ئەوەیە کە بتوانین باس لە چیرۆکی خۆمان بکەین، وەک بڵێی باس لە چیرۆکی کەسانی تر بکەین: بەڵام ئەمە تەنها یەک لایەنی ئەم هونەرە گەورەیەیە کە چوار سەد ساڵە بە هەموو هێزێکیەوە کار دەکاتە سەر خوێنەرەکانی، جۆشوخرۆشی خۆی دەدات بە ئێمەی نووسەر. لایەنەکەی تریشی ئەو شتەیە کە منی برد بۆ کۆڵانەکانی فرانکفۆرت یاخود قارس: توانای نووسینی چیرۆکی کەسانی تر وەک چیرۆکی خۆمان. بەو شێوەیەش بە یارمەتیی ڕۆمانی باش، هەوڵ دەدەین سەرەتا سنوورەکانی کەسانی تر و دواتر سنوورەکانی خۆمان بگۆڕین. "کەسانی تر" دەبن بە ئێمە، "ئێمە" دەبین بە کەسانی تر. هەڵبەتە ڕۆمانێک هەردوو کارەکە لە یەک ساتدا دەکات. هەم ژیانی خۆمان وەک ژیانی کەسێکی تر باس دەکەین، هەم بواری ئەوەمان بۆ دەکاتەوە

کە بتوانین ژیانی کەسانی تر وەک ژیانی خۆمان بنووسین. لەبەر ئەوە پێویست ناکات ناچار بیت بچین بۆ کۆڵان و شاری تر، وەک چۆن من لە ڕۆمانی *بەفر*دا کردوومە. زۆربەی ڕۆماننووسەکان، بە مەبەستی ئەوە هێزی خەیاڵیان بەکار دەهێنن کە بتوانن خۆیان بکەن بە کەسانی تر، باس لە کەسانی تر بکەن وەک بڵێی باس لە خۆیان بکەن. بۆ ئەوەی باشتر باسی ئەمە بکەم، با ئەم نموونەیەتان بدەمێ کە خزمایەتیی ئەدەبییش دەهێنێتەوە یاد: بڵێی چی ڕووی بدایە ئەگەر بەیانییەک خۆم وەک قالۆنچەیەک ببینیایە؟" بە تێڕوانینی من، لەپشت هەموو ڕۆمانە گەورەکانەوە نووسەرێک هەیە کە کەوتۆتە ناو چێژی خەیاڵی ئەوەی خۆی وەک کەسێکی تر ببینێت، داهێنانێکیش هەیە کە زۆر لە سنوورەکانی خۆی دەکات. ئەگەر بەیانییەک وەک قالۆنچەیەکی گەورە خەبەرتان ببێتەوە، کاتێک ئێوە بەدیوار و سەقفەکاندا ڕادەکەن، بۆ ئەوەی پێشبینی بکەن کە دایکتان و باوکتان قێزتان لێ دەکەنەوە، دەترسن و سێوتان تێ دەگرن، زیاد لەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر قالۆنچەکان بکەیت، پێویستە کافکا بیت. بەڵام پێش ئەوەی خۆمان بخەینە شوێنی کەسێکی تر، پێویست دەکات کەمێک لێکۆڵینەوە بکەین. بەزۆرییش دەبێت بیر لەم بابەتە بکەینەوە: ئەم "کەسەی تر" کێیە کە پێویستە بیری لێ بکەینەوە؟

ئەم کەسە کە لە ئێمە ناچێت، دەنگ دەدات بەو خۆپاراستنە سەرەتایی، پەلامار، نەفرەت و ترسە غەریزەییانەی ناخمان، دەزانین کە ئەم هەستانە هێزی خەیاڵ و هێزی نووسینمان دەخاتە جووڵە. "ڕۆماننووس" بە حکومی ئەو

یاسا هونەرییانەی کە بە دەستیەوەیەتی، هەستی کردووە کە خۆچوواندن لەگەڵ ئەم "کەسەی تر"دا ئەنجامێکی باشی دەداتێ. ڕۆماننووس دەشزانێت ئەگەر هەوڵ بدەیت بە پێچەوانەی بیروباوەڕی هەموو کەسێکەوە بیر بکەیتەوە، ئەو کات ئەم بیرکردنەوەیە بەرەو ئازادی دەیبات. دەتوانرێت مێژووی هونەری ڕۆمان وەک مێژووی ئەو خۆگۆڕین و ئازادکردنەی خۆیشمان بنووسرێت کاتێک خۆمان دەخەینە جێگەی کەسێکی تر و بە هێزی خەیاڵمان بەدەستی دەهێنین.

کتێبی ڕۆبینسۆن کرۆزۆ، کتێبێکە کە هێندەی بیرکردنەوە لە ڕۆبینسۆن، توانای بیرکردنەوەیە لە (جومعە)، کە کۆیلەیەتی. دۆن کیشۆتیش ڕۆمانێکە کە هێندەی بیرکردنەوە لەو سوارچاکەی لە دنیای کتێبەکاندا دەژی، بیرکردنەوەیە لە سانچۆ پانزای خزمەتکاری ئەو. دڵخۆش دەبم بە خوێندنەوەی *ئانا کارانینا* وەک ڕۆمانێک کە خەیاڵ لە کوڕێک دەکاتەوە هاوسەرگیرییەکی ئاسوودەی کردووە لەگەڵ ژنێکدا کە هاوسەرگیرییەکی نائاسوودەی کردووە و ئەو دادەڕمێنێت، لە هەمان کاتدا ئەم ڕۆمانە درەوشاوەترین ڕۆمانی تۆلستۆیە. فلۆبێری نووسەر، کە هەرگیز هاوسەرگیریی نەکردووە و هەوڵی داوە خەیاڵ لە ژنێکی نائاسوودەی وەک *مادام بۆڤاری* بکاتەوە، بووە بە نموونەیەک بۆ تۆلستۆی. *مۆبیدیکی* میلڤل، کە گەورەترین خەیاڵی کلاسیکی ڕۆمانی هاوچەرخە، کتێبێکە کە لە ڕێگەی نەهەنگێکی سپییەوە، بیر لە مەترسییەکانی ئەمەریکای ئەو سەردەمە دەکاتەوە، واتە خەیاڵکردنەوە لەو کەسانەی کە لە خۆی ناچن. ئێمەی ئەدەبدۆستان ئەمڕۆ ناتوانین بیر لە باشووری ئەمەریکا بکەینەوە، بەبێ ئەو

ڕەشپێستانەی کە زەمانێک فۆلکنەر خەیاڵی لێ کردوونەتەوە. بە هەمان شێوەش هەست دەکەین کە بەرهەمی ڕۆماننووسێکی ئەڵمانی نوقسان بێت کاتێک بیەوێت باس لە هەموو ئەڵمانیا بکات، بەڵام بە ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ، ئاشکرا یاخود نهێنی خەیاڵ لە تورکەکان نەکاتەوە، یاخود لەبارەی نائاسوودەییەکانی ئەوانەوە نەیەوێت خەیاڵ بکاتەوە. یاخود بە بڕوای من ئەمڕۆ بەرهەمی ڕۆماننووسێکی تورکیش نوقسان دەبێت، ئەگەر خەیاڵ لە کوردەکان، کەمایەتییەکان و ئەو خاڵە تاریکانەی مێژوو نەکاتەوە، کە ناتوانرێت باسیان لێوە بکرێت.

وەک دەزانرێت سیاسەتی ڕۆماننووس شتێک نییە کە ڕۆماننووس خۆی تەرخان بکات بۆ سکاڵا سیاسییەکان و هەوڵی هاوبەشیکردنی بدات لەگەڵ کۆمەڵ و پارتەکاندا. سیاسەتی ڕۆماننووس لە هێزی خەیاڵی ڕۆماننووسەوە سەرچاوە دەگرێت، ڕۆمان هێزی نووسەرە بۆ خۆخستنە جێگەی کەسێکی تر. ئەم هێزە بەتەنها ئەو کەسە نییە کە ئەو ڕاستییە مرۆییانە کەشف دەکات کە هیچ باسیان لێوە نەکراوە، بەڵکو دەیهێنێتە باری وتەبێژی ئەوانەی کە دەنگیان دەر نایەت، تووڕەییەکەیان نابیسترێت، خواستەکانیان پێشێل کراوە و باسیان لێوە نەکراوە. وەک من، کە لە گەنجێتیمدا هەستم پێ دەکرد، پێدەچێت ڕۆماننووس زۆریش نیەتی ئەوەی نەبێت کە بە سیاسەتەوە پەیوەست بێت، یاخود نیەتەکانیان زۆر جیاوازن... *شەیتانەکان*، کە بەنیسبەت ڕابردوو و داهاتووشەوە گەورەترین ڕۆمانی سیاسییە، وەک دیستۆفسکی دەیەوێت، ئەمڕۆ وەک ڕۆمانێک نایخوێنینەوە

کـە دژی بەرۆژئاواییکـەر و نهیلیسـتە ڕوسـییەکان بێت، وەک کتێبێک دەیخوێنینـەوە کـە لەبـارەی ڕۆحـی سـلاڤی و ڕاسـتیی ڕوسییەکانەوە نهێنییەکی زۆر گەورە ئاشکرا دەکات بۆ ئێمە. ئەمـە نهێنییەکـە تەنهـا بـە ڕۆماننووسـین ئاشـکرا دەکرێـت. ناتوانیـن ئـەم جـۆرە زانیارییانـە بـە خوێندنـەوەی ڕۆژنامـە، گۆڤـار و سـەیرکردنی تەلەڤزیـۆن بەدەسـت بهێنیـن. بـە هـۆی ئـەو ڕۆمانانـەوە کـە بەسـەبرەوە خوێندومانتـەوە، فێری ئـەم زانیارییە زۆر تایبەت و بێوێنانـە دەبین کە لەبارەی مێژووی مرۆڤـەکان، میللەتـەکان و ژیانـە تایبەتەکانـەوە نووسـراون و ئێمـە ئاسـوودە دەکـەن، دەمانهەژێنـن، بـە قووڵاییەکـەی دەمانترسـێنن، بـە ئاسـانییەکەی سەرسـامـمان دەکـەن. مـادام بابەتەکـەش کراوەتـەوە، بـا ئـەوە بڵێـم کـە هەسـت دەکـەم خـۆم زۆر بـە نزیـک دەزانـم لـەم نهێنییـەوە کـە *"شـەیتانەکانـی"* دۆستۆیڤسـکی دەیچرپێنێـت بـە گوێـی خوێنەرەکانیـدا، ئـەو نهێنییـەی کـە خنراوەتـە نێـوان چەوسـانەوە، نەفسـبەرزی، شـەرم و توورەبییـەوە و لـە قووڵاییـەوە بەسـتراوەتەوە بـە مێـژووەوە. هەڵبەتـە لەپشـت ئـەم نزیکییـەوە، ئـەو هەسـتی عەشـق، ڕق و گرژییـە ڕۆحییانـەی نووسـەرێک هەیـە لەنێوان ئـەم دوو دنیایـەدا، کـە بەتەواوەتـی خـۆی بـە ڕۆژئاوایـی نابینێت، بـەڵام بـە درەوشـانەوەی شارسـتانییەتی ڕۆژئـاوادا چاوەکانـی بەشـەوارە کەوتـوون.

هاتینـە سـەر بابەتـی ڕۆژهەڵات-ڕۆژئـاوا. کاتێـک ڕۆژنامەنووسـەکان ئـەم پرسـیارە دەکـەن، کـە زۆریـان حـەز لێیـە، سـەیری ئـەو واتایانـە دەکەیـت کـە ئەمـڕۆ هەندێـک بڵاوکـەرەوەی ڕۆژئاوایـی دەیـدەن بـەم وشـانە، بـە شـێوەیەک

بیر لەوە دەکەمەوە، پێدەچێت باشتر بێت کە هیچ باس لە کێشەی ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاوا نەکەیت. چونکە زۆربەی کات وا دەزانرێت کە کێشەی ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاوا ئەوەیە، کە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییە هەژارەکان ملکەچ ناکەن بۆ هەرشتێک کە ڕۆژئاوا و ئەمەریکا فەرمانی کردووە. بەم گۆشە تێڕوانینە ئاماژە بەوەش دەدرێت کە کولتوور، ژیان و سیاسەتی ئەو شوێنانەی منی لێوە هاتووم، بۆ ڕۆژئاوا کێشەیەکی بێزارکەرە، تەنانەت لە نووسەری وەک منەوە چاوەڕوانی ڕێگەچارەیەکیش دەکەن بۆ ئەم کێشانە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە یەکسەر ئەوە بڵێم، کە ئەم شێوازە کەمنرخاندنە پارچەیەکە لە کێشەکە. بەڵام بەدڵنیاییی کێشەی ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاوا هەیە، ئەمە بەتەنها کێشەی شێوازی نیەتخراپیی ڕۆژئاواش نییە، زیاتر کێشەی هەژار-دەوڵەمەندە، لە هەمان کاتیشدا کێشەی ئاشتییە.

دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی ۱۹دا، بەرامبەر سوپاکانی ڕۆژئاوا ڕووبەڕووی ناڕەحەتی بووبوونەوە و بەردەوام تووشی دۆڕاندن بووبوون، کاتێک ئیمپراتۆرییەتیش داڕما، تورکە ژۆنەکان[1] و نەوە بەڕێوەبەرەکانی داهاتوو، تەنانەت دوایین پاشاکانی عوسمانییش، کە کاریگەر بوون بەم سەرکەوتنە درەوشاوەیەی ڕۆژئاوا، دەستیان کرد بە ڕیزێک نوێگەری لە ڕێگەی بەڕۆژئاوابووندا. هەمان لۆژیکیش لەپشت ئەو نوێگەریی بەڕۆژئاواییکردنەی کۆمارییەتی هاوچەرخی

---

۱. ژۆن: ئەو ناوەیە کە دراوە بەو گەنج و ڕۆشنبیرانەی کە لە دوایین سەردەمی ئیمپراتوریەتی عوسمانیدا، لە سەردەمی عەبدول حەمیددا وەک لایەنگری سیستمی دەسەلاتی پەرلەمانتاریەت بەرەنگاری دەسەلات بوونەتەوە.

تورکیا و کەمال ئەتاتورکیشدا هەیە. ئەمە ئەو باوەڕەیە کە بەگوێرەی ئەو ڕۆژانە، بە دامەزراوەکردنی دین، نەریت و کولتووری کۆن، تورکیای هێناوەتە باری هەژاری و لاوازی. منیش کە لە خێزانێکی چینی مامناوەندی بەڕۆژئاواییبووی ئیستانبوڵەوە هاتووم، هەندێک جار دەکەومە ناو ئەم باوەڕە نیەت باش، بەڵام زۆر ساویلکە و سادەیەوە. ئیرادەی گەشبینی بەڕۆژئاواییکەر دەیەوێت بەلاساییکردنەوەی ڕۆژئاوا کولتوور و وڵاتەکەی خۆی پێش بخات و دەوڵەمەندی بکات. بەڕۆژئاواییکردنی عوسمانی-تورک، لە هەمان کاتدا بزوتنەوەیەکی ناوچەچێتی و نەتەوەپەرستییە، لەبەر ئەوەی بۆ ئامانجی زیاتردەوڵەمەندکردن، دڵخۆشکردن و بەهێزکردنی وڵاتەکەی ئەم ڕێگەیەی گرتۆتە بەر. بەڵام لەبەر ئەوەی بەڕۆژئاواییکردنیشە، بەدڵنیاییی لە قووڵاییییەوە ڕەخنە لە کولتوور و هەندێک تایبەتمەندیی بنچینەییی وڵاتەکەی خۆی دەگرێت، تەنانەت ئەگەر بە هەمان قاڵب و شێوازیش نەبێت، وەک ڕۆژئاوایییەکان بەهەڵە و بێبەهای دەزانێت... ئەمەش بە هۆی ئەو هەڵوێستانەی کە هەموو کات پێشانی ڕۆمانەکانم دەدرێت، بە هۆی پەیوەندییەکانم لەگەڵ ڕۆژئاوادا هەستم پێ کردووە، کە هەستێکی زۆر جیاواز و تێکەڵ دەهێنێتە ئاراوە، ئەویش هەستی "شەرم"ە. کێشەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، یاخود ئەگەر بەو وشانە بیڵێین کە زیاتر نزیکن لە منەوە، نەریتی- هاوچەرخی، یاخود کێشەکانی نێوان مەملەکەتەکەم لەگەڵ ئەورووپادا لەسەر هەستی شەرمێک گەشە دەسێنێت، کە هیچکات بەتەواوەتی کۆتایی نایەت. هەموو کات هەوڵ دەدەم ئەم شەرمە لەگەڵ هەستی "شانازیدا" ببینم، کە

هەستێکی ڕێک پێچەوانەیە. هەموومان دەزانین: لە شوێنێکدا کە کەسێک زۆر بە شانازی و فیزەوە هەڵسوکەوت دەکات، کەمنرخاندن و شەرمەزاریی "ئەوی تر" هەیە لە هەمان شوێندا. یاخود کەسێک کە بیر لەوە دەکاتەوە زۆر نزم کراوەتەوە، بە هەڵوێستێکی نەتەوەپەرستی بەفیزەوە دێتە بەرامبەرمان. ڕۆمانەکانم بە کەرەستەکانی ئەم جۆرە شەرم، شانازی، چەوسانەوە و ڕقە نووسراون. لەبەر ئەوەی لە وڵاتێکەوە هاتووم کە لە دەرگای ئەورووپای داوە، دەزانم کە ئەم هەستە ناسکانە هەندێک جار چەند بەئاسانی بەگڕەوە دەگاتە ئاستێکی مەترسیدار. دەمویست بەو چرپەیەی کە هەستم دەکرد گوێم لێیە کاتێک ڕۆمانەکانی دۆستۆیڤسکیم دەخوێندەوە، باس لەم شەرمە بکەم وەک بڵێی نهێنییەک بدەم. هونەری ڕۆمان فێری کردم ئەگەر لەگەڵ کەسانی تردا هاوبەشیی ئەو شەرمانە بکەین کە وەک نهێنییەک دەمانەوێت بیانشارینەوە، ئازادمان دەکات.

بەڵام لەو شوێنەدا کە ئەم ئازادییە دەست پێ دەکات، لە دڵەوە هەست بە کێشەکانی نوێنەرایەتی و دەردە ئەخلاقییەکانی قسەکردن دەکەم بە ناوی کەسێکی ترەوە. ئەو هەستە ناسکەی کە باسم لێوە کرد، شەرمی نەتەوەپەرستی یاخود هەستی ناوچەچێتی، نائاسوودە دەبن هەم بە تێڕوانین هەم بە هێزی خەیاڵی ڕۆماننووس. ئەو ڕاستییەی کە ئەگەر وەک نهێنییەک بمێنێتەوە، تەنها بەبێدەنگی شەرمەزارمان دەکات، بەهێزیی خەیاڵی ڕۆماننووس لە باری نهێنی دەر دەچێت، دەبێت بە دووەم دنیا کە پێویستە ڕووبەڕووی ببیتەوە. تا ڕۆماننووس بە هەستێکەوە یاری بکات کە نازانێت چییە،

وەک منداڵێک کە یاری بە یاساکانی دنیا، ئەندازە نهێنییەکانی ژیان و یاریچەکانی دەکات، خێزان، کۆمەڵ، هاوشار، هۆزەکان و هەموو کەس بە ڕێژەیەک نائاسوودە دەبن. ئەمە نائاسوودەییەکی دڵخۆشە. تاکو ڕۆمان بخوێنینەوە، هەست دەکەین ئەو دنیایەی کە تێدا دەژین دروستکراوی کەمانێکە، وەک ئەفسانەکان و چیرۆکەکان، هەروەها ئەو قسەیە دەخاتە مەیدانەوە کە لەلایەن خێزان، قوتابخانە و کۆمەڵگەکانەوە سەری داپۆشراوە؛ لەوەش گرنگتر، دەیهێنێتە باوێک کە گونجاو بێت بۆ بیرکردنەوە. هەموومان چێژی خوێندنەوەی ڕۆمان دەزانین: دڵخۆش دەبین بە سەیرکردنی مرۆڤێک کە لەنێوان مرۆڤەکانی تردا ڕێگە دەکاتەوە بۆ خۆی، بە ئەقڵ و ڕۆحی بەگژ دنیادا دەچێتەوە، دڵخۆش دەبین بە گۆڕانی و بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ مرۆڤەکان و شتەکانی دەوروبەریدا، لە هەمان کاتدا دڵخۆش دەبین بە سەرنجدان لەو وشە، هەڵوێست، وریایی و بەبڕیارییەی، کە نووسەر بەکاری دەهێنێت بۆ نووسینەوەی ئەم ڕووداوانە. دەزانین ئەو شتەی کە دەیخوێنینەوە هەم بەرهەمی هێزی خەیاڵی نووسەرە، هەم بە کەرەستەکانی ئەم دنیایە دروست کراوە کە تێیدا دەژین. ڕۆمانەکان نە بەتەواوەتی خەیاڵن، نە بەتەواوەتی ڕاستییش. ڕۆمانخوێندنەوە، هەم ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ هێزی خەیاڵی نووسەردا، هەم ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە پەیوەستین پێوەی و بە مەراقمان دەیورووژێنین. کاتێک لە گۆشەیەکدا دادەنیشین، لەسەر جێگەیەک، کەرەوێتەیەک ڕادەکشێین و ڕۆمان دەخوێنینەوە، هێزی خەیاڵمان بەردەوام لەنێوان دنیای ڕۆمانەکە و دنیای

خۆماندا کار دەکات. ئیتر لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا ئێمەش دەستمان کردووە بە خەیاڵکردنەوە لەو شوێنەی کە نەچووین بۆی، لەو "کەسەی تر،" کە بەتەواوەتی نایناسین. یاخود هەمان گەشت بەرەو قووڵاییی ڕۆحی کەسێک دەکەین کە لە خۆمان دەچێت. یەکیەک سەرنج ڕادەکێشم بۆ ئەم جۆرە حاڵانە، چونکە ئێستا دەمەوێت خەیاڵێکتان بەباشی بۆ باس بکەم، کە هەندێک جار دێتە بەرچاوم. هەندێک جار هەوڵ دەدەم یەکیەک خوێنەرانی ڕۆمان بهێنمە بەرچاوی خۆم، لەو جوگرافیایەی کە تێیدا دەژین و چوونەتە گۆشەیەکەوە، لەسەر قەنەفەیەک دانیشتوون ڕۆمان دەخوێننەوە. ئەو کات هەزارەها و دەیان هەزار خوێنەر لە بەرچاومدا بەم شێوەیە زیندوو دەبنەوە، کاتێک کتێب دەخوێننەوە بیر لە خەیاڵەکان، قارەمانەکان و دنیای نووسەرەکە دەکەنەوە، چوونەتە ناو جوگرافیاکان و شارەکانەوە. ئیتر ئەم خوێنەرانە ڕێک وەک نووسەرەکە خۆی هێزی خەیاڵیان بەکار دەهێنن، هەوڵ دەدەن خۆیان بخەنە شوێنی کەسێکی تر. ئەمانە ئەو ساتانەن کە سنگفراوانی، سادەیی، بەزەیی و خۆشەویستی لە ڕۆحماندا دەکەونە جووڵە: ئەو شتەی کە ئەدەبیاتی باش ئاماژەی بۆ دەکات هێزی دادگاییکردنمان نییە، ئەو بەهرەیەمانە کە بتوانین خۆمان بخەینە جێگەی کەسێکی تر.

ج کاتێک هەوڵ بدەم ئەم خوێنەرانە بهێنمە بەرچاوی خۆم کە بە بەهرەوە هێزی خەیاڵیان خستۆتە کار و بڵاو بوونەتەوە بە کۆڵان، گەڕەک و شاری جیاوازدا، لە ڕاستیدا تێدەگەم کە بیر لە کۆمەڵێک، تاقمێک و میللەتێک دەکەمەوە کە خەیاڵ لە خۆیان دەکەنەوە. لە سەردەمەکەماندا کۆمەڵ، هۆز

و میللەتەکان لە ڕێگەی ڕۆمانەکانەوە قووڵترین بیرکردنەوە دەدۆزنەوە لەبارەی خۆیانەوە، لە ڕێگەی ڕۆمانەکانەوە مناقەشەی خۆیان دەکەن، لەبەر ئەوە زۆربەمان کاتێک ڕۆمانێک دەگرین بە دەستمانەوە و دەیخوێنینەوە بۆ ئەوەی دڵخۆش بین، چێژ وەر بگرین، تەنانەت بۆ ئەوەی ڕابکەین لە بێزاریی ژیانی ڕۆژانە، بەبێ ئەوەی درک بەو کۆمەڵ، میللەت و کۆمەڵگەیە بکەین کە پەیوەستین پێوەی، دەست دەکەین بە خەیاڵکردن. ئەمەیە ئەو شتەی وا دەکات کە ڕۆمانەکانیش بتوانن هێندەی باس لە دڵخۆشی و شانازیی میللەتان بکەن، ئەوەندەش باس لە ڕق، دڵناسکی و شەرمەکانیان بکەن. بە هۆی ئەم هەستی دڵناسکی، شەرم و شانازییەوە تاکو ئێستاش تووڕە دەبن لە ڕۆماننووسەکان، مەخابن تا ئێستا نموونەی لێنەبوردن پیشان دەدرێت، ڕۆمانەکان دەسووتێندرێن، یاخود سکاڵا لەسەر ڕۆماننووسەکان تۆمار دەکەن.

لەماڵێکدا گەورە بووم کە ڕۆمانی تێدا دەخوێنرایەوە. باوکم کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو، کاتێک منداڵ بووم، باوکم وەک هەندێک لەو باوکانەی کە لە ماڵەوە باسی جەنەڕاڵەکان و ئەولیاکان دەکەن، باسی ئەو ڕۆماننووسە گەورانەی بۆ دەکردم کە کەمێک پێشتر من باسم لێوە کردن، باسی لە تۆماس مان، کافکا و دۆستۆیفسکی یاخود تۆلستۆی دەکرد. کاتێک منداڵ بووم، هەموو ئەم ڕۆمان و ڕۆماننووسە گەورانە لەگەڵ بیرکردنەوەیەکی ئەورووپاییدا لە سەرمدا یەکیان گرتبوو. ئەمە بەتەنها لەبەر ئەوە نا لە خێزانێکی ئیستانبوڵیی وەهاوە هاتووم کە لە ناخەوە باوەڕی بە بەڕۆژئاواییبوون هەیە و بە هۆی ئەمەوە بەساویلکەیی

وڵاتەکەی خۆی زیاتر بە ڕۆژئاوایی دەبینێت وەک لەوەی کە هەیە... بەڵکو ئەمە لەبەر ئەوەشە کە هونەری ڕۆمان یەکێکە لە گەورەترین ئاشکراکردنی هونەری، کە ئەورووپا گەشەی پێ سەندووە. بە تێڕوانینی من، ئەوەی ئەورووپای کردووە بە ئەورووپا، پێناسەی شووناسەکەی دەکات و دیاریی دەکات و یەکێکە لە بەردەکانی بناغەی پێکهاتەکەی، لەدوای ڕێنسانسەوە هونەری ڕۆمان و وێنەکێشانە لەگەڵ موزیکی ئۆرکسترالیدا. من ناتوانم بیر لە ئەورووپا بکەمەوە بەبێ ڕۆمانەکانی. ئەمە وەک بیرکردنەوە و تێگەیشتن و شێوازی خەیاڵکردن یاخود وەک چالاکیی خۆخستنەجێگەی کەسێکی تر ڕاستە. بەڵام ڕاستیشە لەبەر ئەوەی ڕۆمانەکان بەگشتی گەواهیدەری کولتوور و مێژووشن. لە ناوچە جیاوازەکانی دنیادا منداڵان و گەنجان بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی ڕۆمانەکانەوە بەقووڵی ئەورووپایان ناسیوە؛ منیش لەوانەم. با ئەو ساتانە بهێنینەوە یادمان کە قارەیەکی نوێ، کولتوورێکی نوێ و شارستانییەتێک لە سنوورەکانی ئەورووپادا ڕۆمان دەناسێت و بە ویست و ئیلهامەوە بەکاری دەهێنێت و لە ڕێگەی ڕۆمانەوە خۆی دەر دەبڕێت، لەبەر ئەمەش بەشداریی ئەورووپا دەکات... بیر لە هاتنەمەیدانی ڕۆمانی گەورەی ڕوسی و ڕۆمانی ئەمەریکای لاتین بکەینەوە کە هاتۆتە باری ئەوەی ببێت بە پارچەیەک لە کولتووری ئەورووپا... تەنانەت تەنها خوێندنەوەی ڕۆمان پیشانی ئێمەی دەدات کە هەموو کات کرۆک، مێژوو و سنوورەکانی ئەورووپا گۆڕاون. ئەورووپای کۆن، کە لە ڕۆمانە فەرەنسی، ڕوسی و ئەڵمانییەکانی ناو کتێبخانەکەی باوکمدا باسی لێوە دەکرێت، یاخود ئەورووپای

دوای جەنگ، یاخود ئەوروپاکەی ئەمڕۆ، هەموو کات شوێن و فیکری گۆڕاون. بەڵام هەمیشە لە مندا خەیاڵی ئەوروپایەکی جێگیر هەیە، ئێستا باس لەوە دەکەم.

بەڵام بەنیسبەت تورکیکەوە بابەتی ئەوروپا زۆر ناسک و هەستیارە. منیش وەک زۆربەی تورکەکان لە ناخمدا خواست و نیەتی باش و مەراقەکانی خەمی ڕەتکردنەوەی پیاوێک هەڵدەگرم کە لە دەرگا دەدات، دەیەوێت بیکەنە ژوورەوە، بەگوێرەی ئەمەش هەستی تووڕەییەکەی هەڵدەگرم. ئەمە بابەتێکە ڕێک لەبارەی ئەو شەرمەوە کە کەمێک پێشتر باسم کرد. لە دەرگا دەدەیت، چاوەڕێ دەکەیت، پەیمان وەر دەگریت، بەهیوا دەبیت و لەگەڵ ئەوشدا ناتوانیت بچیتە ژوورەوە. تا تورکیا نزیک بێتەوە لە ئەوروپا، تاکو بوونبەئەندامێتیی تورکیا وەک شتێکی ڕاستەقینە لە یەکێتیی ئەوروپادا بێتە مەیدانەوە، بەداخەوە لە بەشێکی ئەوروپادا، لەنێوان هەندێک سیاسەتمەدارەکاندا، بە شێوەیەکی بەرچاو زیاتر هەستی دژ بە تورکیا دێتە مەیدانەوە. ئەو شێوازەی کە هەندێک لە سیاسەتمەدارەکان لە دواییین هەڵبژاردندا دژی تورکیا و تورکەکان بەکاریان هێنا، هێندەی شێوازی هەندێک لە سیاسەتمەدارە تورکەکان بە مەترسیداری دەزانم کە مەراقی شەڕیان هەیە لەگەڵ ئەوروپا و ڕۆژئاوادا. ڕەخنەگرتن لە کەموکورتیی دیموکراسیی دەوڵەتی تورکی، یاخود بۆ نموونە بابەتەکانی وەک باری دارایی، شتێکە کەمنرخاند و بەسووکزانینی هەموو کولتووری تورک، یاخود ئەو تورکانەی لە ئەڵمانیادا لە ئەڵمانەکان هەژارترن و ژیانێکی قورس بەسەر دەبەن شتێکی ترە. تورکەکان وەک کەسێکی

دڵشکاو کە لە دەرگا دەدات و دەیەوێت بیکەنە ژوورەوە، گوێ لەم قسە خراپانە دەگرن کە لەبارەیانەوە دەکرێت. بەداخەوە پەرەسەندنی نەتەوەپەرستی لە ئەوروپادا دژی تورکەکان سوودی هەیە بۆ وروورژاندنی نەتەوەپەرستییەکی ناقۆلا دژی ئەورووپا. ئەوانەی باوەڕیان بە یەکێتیی ئەورووپا هەیە، پێویستە چی زووترە ئەوە ببینن کە کێشەکە لەنێوان ئاشتی و نەتەوەپەرستیدایە. هەڵبژاردنەکەمان لەنێوان ئەم دووانەدا دەکەین. بە شێوەیەک بیر لەوە دەکەمەوە، کە بیرکردنەوەی ئاشتی لە دڵی یەکێتیی ئەورووپادا جێگیرە، باوەڕیشم وایە ئەورووپا ئەو بواری ئاشتییە ڕەت ناکاتەوە کە ئەمڕۆ تورکیا پێشنیاری کردووە. کێشەکە هاتە بارێک هەڵبژاردن بکەیت لەنێوان هێزی خەیاڵی ڕۆماننووس و نەتەوەپەرستیی ئەوانەی کە کتێب دەسووتێنن.

لەبەر ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا بەچڕی تێڕوانینەکانم خستۆتە ڕوو لەبارەی پەسەندکردنی تورکیا لەلایەن یەکێتیی ئەوروپاوە، زۆر گوێدێری پرسیاری بەگومان و نەرێنییش بووم. با یەکسەر وەڵامی ئەوانەش بدەمەوە. یەکەم شت کە تورکیا و تورکەکان پێشنیاری دەکەن بۆ ئەورووپا، هەڵبەتە ئاشتییە، ویستی بەشداریبوونی وڵاتێکی مسوڵمان بۆ ناو یەکێتیی ئەورووپا و دانپێدانانی ئەم نیەتە ئاشتیخوازانەیە، متمانە و هێز دەدات بە ئەورووپا و ئەڵمانیا. لە سەردەمی منداڵی و گەنجێتیمدا نووسەرە گەورەکانی ئەو ڕۆمانانەی کە دەمخوێندنەوە، لە ڕێگەی تاکەوە پێناسەی ئەورووپایان دەکرد نەک لە ڕێگەی کریستیانییەتەوە. ئەم ڕۆمانانە ڕێک بەدڵی من بوون، چونکە لە ڕێگەی ئەو قارەمانانەی کە هەوڵ دەدەن ئازادی، داهێنان و

ویستەکانیان بەدی بهێنن، باسیان لە ئەورووپا کردووە. لەبەر ئەوە ئەورووپا پەسەند دەکرێت، چونکە لە دەرەوەی دنیای ڕۆژئاوادا هەستەکانی ئازادی، یەکسانی و برایەتی دەژیێنێت. ئەگەر ڕۆحی ئەورووپا ڕووناکی، یەکسانی و دیموکراتی بێت، ئەوا پێویستە تورکەکان لەم ئەورووپا ئاشتیخوازەدا شوێنی خۆیان وەر بگرن. ئەورووپایەک کە بەتەنها پشت بەکریستیانییەت ببەستێت، دەبێت بە شوێنێک کە سەیری ڕابردروو بکات، گەڕابێتەوە ناو خۆی، ڕێک وەک تورکیا، کە بەتەنها هەوڵ دەدات هێز لە دین وەر بگرێت. بەنیسبەت کەسانێکی وەک منەوە کە وەک منداڵێکی ئیستانبوڵی بەڕۆژئاوابوو، لایق بەخێو کراون، باوەڕکردن بە یەکێتیی ئەورووپا شتێکی قورس نییە. بیرتان نەچێت هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە ئەو تیپی تۆپی پێیەی کە من هەواداری بووم و بە ناوی فەنەرباخچەوەیە، لە کاسەکانی ئەورووپادا یاریی تۆپی پێ دەکات. ملیۆنەها تورک هەیە کە وەک من لە دڵەوە، بەهێزەوە باوەڕیان وایە شوێنی تورکیا ناو یەکێتیی ئەورووپایە. بەڵام لەوەش گرنگتر، ئەمڕۆ زۆربەی زۆری تورکە موحافیزەکان، مسوڵمانەکان و نوێنەرە سیاسییەکانیشیان دەیانەوێت تورکیا لەناو یەکێتیی ئەورووپادا ببینن و لەگەڵ ئێوەدا بیر لە ئەورووپای داهاتوو بکەنەوە و پێکی بهێنن. دوای ئەو شەڕ و جەنگانەی کە سەدەها ساڵیان خایاند، پێدەچێت ڕەتکردنەوەی ئەم دەستە دۆستانەیە قورس بێت. وەک چۆن ناتوانم بیر لە تورکیایەک بکەمەوە کە خەیاڵی ئەورووپای نەبێت، دەزانم کە باوەڕ بە ئەورووپایەکیش ناکەم کە خەیاڵی تورکیای نەبێت.

داوای لێبووردن دەکەم، لەبەر ئەوەی هێندە زۆر باسم لە سیاسەت کرد.

بەدڵنیایی ئەو دنیایەی کە دەمەوێت پەیوەستی بم، دنیای هێزی خەیاڵە. لەنێوان تەمەنی حەوت بۆ بیستودووساڵیمدا ویستبووم ببم بە وێنەکێش، چووبوومە کۆڵانەکانی ئیستانبوڵەوە، وێنەی دیمەنەکانی شارم کێشابوو. دواتر کاتێک بیستودوو ساڵ بووم، وەک لە کتێبی *ئیستانبول*دا باسم کردووە، وازم لە وێنەکێشان هێنا، دەستم کرد بە ڕۆماننووسین. ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە کە هەر هەمان شتم کردووە، ئیتر وێنە بێت یاخود نووسین: ئەو شتەی کە منی بەستۆتەوە بە وێنە و نووسینەوە، ویستی پەنابردنە بۆ ئەو دووەم دنیایەی کە دەوڵەمەندتر و تێکەڵاوترە لەو دنیا بێزارکەر، خنکێنەر و ئومێدشکێنەی کە دەیزانین و دەیناسین. حەز دەکەیت وەک سەردەمی منداڵی و گەنجێتیم بە هێڵکاری و ڕەنگەکان دەر برین بۆ ئەم دووەم دنیا ناوازەیە بکەم، یاخود وەک دوایین سی ساڵم بە وشەکان پێکیبهێنم، بۆ ئەوەی بەوردی بیری لێ بکەمەوە، پێویستە هەموو ڕۆژێک لە ژوورێکدا بۆ ماوەیەکی زۆر بەتەنها بمێنمەوە. ئەم دووەم دنیا دڵنەوایکەرەی کە بۆ ماوەی سی ساڵ بە مانەوەم لە گۆشەیەکدا پێکمهێناوە، هەڵبەتە بە کەرەستەکانی ئەم دنیایە دروستی دەکەم کە دەیزانین، یاخود بەو شتانەی کە لە کۆڵانەکانی ئیستانبوڵ، قارس و فرانکفۆرتدا بینیومن. بەڵام هێزی خەیاڵمان، هێزی خەیاڵی ڕۆماننووس، ڕۆحێکی زۆر سیحراوی و تایبەت دەدات بەم دنیا ڕاستەقینە سنووردارە.

ئێستا باس لەم ڕۆحە، ئەو شتە دەکەم کە ڕۆماننووسێک هەموو تەمەنی خۆی پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی خوێنەر بهێنێتە بارێک کە هەستی پێ بکات. بە تێڕوانینی من ژیان شتێکی زۆر تێکەڵ و سەیر و قورسە بۆ تێگەیشتن، بەتەنها ئەگەر بخرێتە

ناو چوارچێوەیەکەوە ئینجا ئێمە دڵخۆش دەکات. زۆربەی کات هۆکاری دڵخۆشی و دڵناخۆشیمان بەدەر لە ژیان خۆی، ئەو واتایەیە کە دەیدەین بەو. هەموو ژیانی خۆم دا بە لێکۆڵینەوە لەم واتایە. ئەمە واتای ئەوەیە بتوانیت لەناو ژاوەژاو، گرمەگرم و نێوان پێچاوپێچە سەرسوورهێنەرەکانی ژیاندا سەرەتایەک، ناوەندێک و کۆتاییەک بدۆزیتەوە لەناو دنیا تێکەڵ، قورس و خێراکەی ئەمرۆماندا... بە تێڕوانینی منیش ئەمە شتێکە کە تەنها بە ڕۆمانەکان دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت... دوای ئەوەی ڕۆمانی بەفرم نووسی و بڵاوم کردەوە، هەموو جارێک کە دەچوومە ئەو کۆڵانانەی فرانکفۆرت کە قارەمانەکەم بەناوی (کا)وە تێیاندا دەگەڕا، هەستم دەکرد وەک بڵێی لەگەڵ تارماییەکەی ئەودا ڕێکەوتی یەکتریمان کردووە و بەگوێرەی خۆم ناوەندێک و واتایەکی تایبەتی شارم دۆزیوەتەوە. بە تێڕوانینی من قسەکەی مالارمی زۆر بەڕاست دەزانم کە دەڵێت، "هەموو شتەکانی دنیا بۆ ئەوە هەیە کە بچنە ناو کتێبێکەوە." ئەگەر کتێب باشترین شت بێت کە هەموو شتەکانی دنیا بگرێتە خۆی، ئەوا بە فیکری من بێگومان ڕۆمانەکانن. دوای سەدەها ساڵ، تاکو ئێستاش ڕۆمانەکان بە باشترین شێوە باس لە گەورەترین بەهرە، هێزی خەیاڵی مرۆڤایەتی و بەهرەی تێگەیشتن لە کەسانی تر دەکەن. بیر لەوە دەکەمەوە، لەبەر ئەوەی سی ساڵە بەدڵسۆزانە خزمەتی هونەری گەورەی ڕۆمانم کردووە ئەم خەڵاتە گەورەیەم پێ بەخشراوە، لە ناخەوە سوپاسی هەمووتان دەکەم.

تشرینی یەکەم ٢٠٠٥، فرانکفۆرت.
وتاری پاموک پێش وەرگرتنی خەڵاتی ئاشتی.

# براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ لە بواری ئەدەبدا

٢٠٠٦ – ئۆرهان پاموک (تورکیا)

٢٠٠٥ – هارۆڵد پانتێر (ئینگیلتەرە)

٢٠٠٤- ئەلفرید یێلینێک (نەمسا)

٢٠٠٣ – ج. م. کۆتزی (باشووری ئەفەریقا)

٢٠٠٢ – ئیمرە کیرتەز (هەنگاریا)

٢٠٠١ – ڤ. س. نایپاوڵ (لەدایکبووی ترینیدات، ئینگیلتەرا)

٢٠٠٠ – گایۆ زینجییان (لەدایکبووی چین، فەرەنسا)

١٩٩٩ – گوینتەر گراس (ئەڵمانیا)

١٩٩٨ – جۆزە ساراماگۆ (پوتوغال)

١٩٩٧ – داریۆ فۆ (ئیتالیا)

١٩٩٦ – ویزلۆوە زیمبورسکا (پۆلۆنیا)

١٩٩٥ – شەیمەس هینیت (ئیرلەندا)

١٩٩٤ – كەنزابیرۆ ئووا (ژاپۆن)

١٩٩٣ – تۆنی مۆریسۆن (ئەمەریکا)

١٩٩٢ – دێرک والکێت (ست. لوسییا)

١٩٩١ – نادین گۆردمیر (باشووری ئەفەریقا)

١٩٩٠ – ئۆکتاڤیۆ پاز (مەکسیک)

١٩٨٩ – کامیلۆ خۆزە سیلا (ئیسپانیا)

١٩٨٨ – نەجیب مەحفوز (میسر)

١٩٨٧ – جۆزیف برۆدسکی (ئەمەریکا)

١٩٨٦ – وۆل سۆینک (نێجیریا)

١٩٨٥ – کلاود سیمۆن (فەرەنسا)

١٩٨٤ – جیرۆسلاڤ سایفیرت (چیک سلۆڤاکیا)

١٩٨٣ – ولیام گۆلدین (ئینگیلتەرە)

١٩٨٢ – گابریال گارسیا مارکیز (کۆلۆمبیا)

١٩٨١ – ئیلیاس کانیتی (ئینگیلەتەرا)

١٩٨٠ – زێزلۆ میلۆس (پۆلۆنیا - ئەمەریکا)

١٩٧٩ – ئۆدیسیس ئەلیتس (یۆنان)

١٩٧٨ – ئازەک باشەویس سینگەر (ئەمەریکا)

١٩٧٧ – ڤیسێنتێ ئەلیخاندرێ (ئیسپانیا)

١٩٧٦ – ساوڵ بێللۆ (ئەمەریکا)

١٩٧٥ – یوجین مۆتایل (ئیتالیا)

١٩٧٤ – ئڤاینت جانسن (سوید). هێری ماترسن (سوید)

١٩٧٣ – پاتریک وایت (ئوستترالیا)

١٩٧٢ – هینرج بوول (ئەڵمانیا)

١٩٧١ – پابلۆ نێرودا (شیللی)

١٩٧٠ – ئەلێکساندەر سۆلجنتسین (یەکێتیی سۆڤێت)

١٩٦٩ – سامۆیل بێکت (ئیرلەندا)

١٩٦٨ – یاسوناری کاواباتا (ژاپۆن)

١٩٦٧ – میگوێل ئەنخێل ئەستوریاس (گواتەمالا)

١٩٦٦ – ساموێل ئێگنۆن (ئیسرایل). نێلی ساچێس (سوید)

١٩٦٥ – میخایل شلۆخوف (یەکێتیی سۆڤێت)

١٩٦٤ – جان پۆل سارتەر(فەرەنسا)، بەلام ڕەتی کردەوە.

١٩٦٣ – جۆرجۆس سیفیرایس (یۆنان)

١٩٦٢ – جۆن ستیبێک (ئەمەریکا)

١٩٦١ – ئایڤۆ ئەندریک (یوغوسلافیا)

١٩٦٠ – ساینت- جان پیرس (فەرەنسا)

١٩٥٩ – سەلڤاتۆر کاسیمۆدۆ (ئیتالیا)

١٩٥٨ – بۆریس پاسترنەک (یەکێتیی سۆڤێت)

١٩٥٧ – ئەلبێرت کامۆ (فەرەنسا)

١٩٥٦ – هوان ڕامۆن هیمەنێز (ئیسپانیا)

١٩٥٥ – هالدۆر لاکسنێس (ئیزلەندا)

١٩٥٤ – ئارنست هەمەنگوای (ئەمەریکا)

١٩٥٣ – وینستن چیرچڵ (ئینگلتەرا)

١٩٥٢ – فرانچۆیس ماوریک (فەرەنسا)

١٩٥١ – پیرلاگەرگیڤیست (سوید)

١٩٥٠ – بیرنارد روسێل (ئینگلتەرا)

١٩٤٩ – ولیەم فۆکنەر (ئەمەریکا)

١٩٤٨ – ت. س. یلیۆت (ئینگلتەرا)

١٩٤٧ – ئەندرێ گایدە (فەرەنسا)

١٩٤٦ – هێرمان هیسە (لەدایکبووی سوید. ئەڵمانیا)

١٩٤٥ – گابریال میسترال (شیللی)

١٩٤٤ - جانێس ڤ. نییەسن (دانیمارک)

١٩٣٩ – فرانس ئیمایل سیانپا (فینلەندا)

١٩٣٨ – پیرل بێک (ئەمەریکا)

١٩٣٧ – ڕۆگێر مارتین دو گارد (فەرەنسا)

١٩٣٦ – یوجین ئۆنیول (ئەمەریکا)

١٩٣٤ – لویجی پیرێندێلۆ (ئیتالیا)

١٩٣٣ – ئاڤن بونن (یەکیتیی سۆڤێت)

١٩٣٢ – جان گاڵسۆرتی (ئینگلتەرا)

١٩٣١ – ئەریک ئاکزل کارلفێلد (سوید)

١٩٣٠ – سینکلایر لویس (ئەمەریکا)

١٩٢٩ – تۆماس مان (ئەڵمانیا)

١٩٢٨ – سیگریت ئەنساد (نەرویج)

١٩٢٧ – هینری بێرگسۆن (فەرەنسا)

١٩٢٦ – گرزیا دیلیدا (ئیتالیا)

١٩٢٥ – جۆج بەرنارد شۆ (ئینگلتەرا)

١٩٢٤ – ولادیسلاو ڕایمۆند (پۆڵۆنیا)

١٩٢٣ – ویلیەم بۆتلەر یتس (ئیرلەندا)

١٩٢٢ – جیسینتۆ بیناڤێنت (ئیسپانیا)

١٩٢١ – ئاناتۆلی فڕانس (فەرەنسا)

١٩٢٠ – نەت هامسن (نەرویج)

١٩١٩ – کارڵ سپیتەلەر (سوسرا)

١٩١٧ – کارڵ دالیرەپ (دانیمارک). هێنریک پانتۆپیدن (دانیمارک)

١٩١٦ – ڤێرنەر ڤان هیدنستێم (سوید)

١٩١٥ – ڕۆمان رۆلاند (فەرەنسا)

١٩١٣ – ڕەبیندرانس تاگۆر (هندستان)

١٩١٢ – جێرهارت هۆپتمێن (ئەڵمانیا)

١٩١١ – مۆریس میتیرلانک (بەلجیکا)

١٩١٠ – پۆڵ هێیس (ئەڵمانیا)

١٩٠٩ – سەلما لاجیرلاف (سوید)

١٩٠٨ – ڕودۆڵف ئەیکن (ئەڵمانیا)

١٩٠٧ – ڕودیارد کیپلین (ئینگلتەرا)

١٩٠٦ – جاسیۆ کارداسی (ئیتالیا)

١٩٠٥ – هێنریکساینکیانڤەچ (پۆڵۆنیا)

١٩٠٤ – جۆزێ ئەشگای (ئیسپانیا). فریدریک میسترال (فەڕەنسا)

١٩٠٣ – بیرنسترین بیرنسۆن (نەرویج)

١٩٠٢ – سیدۆر مامسن (ئەڵمانیا)

١٩٠١ – سالی پرۆدهم (فەرەنسا)

## زانكۆی ئۆكلاهاما:
## میوانە بەڕێزەكانی كۆنفرانسی پەتەربوگ

٢٠٠٦ – ئۆرهان پاموک (تورکیا)

٢٠٠٤ – نیلایدا پاینین (بەڕازیل)

٢٠٠٣ – ج. م كۆیتزی (باشووری ئەفەریقا)

٢٠٠٢ –ڕۆبێرتۆ فێرناندێز ڕیتامار (کوبا)

٢٠٠١ – کەنزابورۆ ئووا (ژاپۆن)

١٩٩٩ – زیسلۆ میلۆس (پۆلۆنیا)

١٩٩٧ – ژ. م. گ. کلیزیۆ (فەرەنسا)

١٩٩٥ – لویس ڤالەنزوێلا (ئەرجەنتین)

١٩٩٣ – ماریس کۆندە (گوادلاپ)

١٩٩١ – مانوێل پایگ (ئەرجەنتین)

١٩٨٩ – ئیدوارد گلیساند (مارتینیک)

١٩٨٧ – گیامۆ کابرێرا ئینفانتی (کوبا)

١٩٨٣ – کارلۆس فوێنتێس (مەکسیک)

١٩٨١ – میشێل بوتۆر (فەرەنسا)

١٩٧٩ – ئیس بۆنفۆی (فەڕەنسا)

١٩٧٧ – ماریۆ ڤارگاس یۆسا (پێرو)

١٩٧٥ – جولیۆ کۆرتێزار (ئەرجەنتین)

١٩٧٣ – داماسۆ ئالۆنسۆ (ئیسپانیا)

١٩٧١ – ئۆکتاڤیۆ پاز (مەکسیک)

١٩٦٩ – جۆرج لویس بۆرگێس (ئەرجەنتین)

١٩٦٨ – جۆرج گەوین (ئیسپانیا)

## یەکێتیی بڵاوکەرەوەکانی ئەڵمان:
## براوەکانی خەڵاتی ئاشتی

٢٠٠٦ – ۆلف لەپەنیز (ئەڵمانیا)

٢٠٠٥ – ئۆرهان پاموک (تورکیا)

٢٠٠٤ – پیتر ئێسترهازی (هنغاریا)

٢٠٠٣ – سوزن سانتاگ (ئەمەریکا)

٢٠٠٢ – چیناو ئاچیب (نێجیریا)

٢٠٠١ – ژەرجن هەبەرماس (ئەڵمانیا)

٢٠٠٠ – ئاسیا دیجیبار (جەزائیر)

١٩٩٩ – فریتز ستێرن (ئەڵمانیا - ئەمەریکا)

١٩٩٨ – مارتین واڵسر (ئەڵمانیا)

١٩٩٧ – یەشار کەمال (تورکیا)

١٩٩٦ – ماریۆ ڤارگاس یوسا(پێرو)

١٩٩٥ – ئانەمارییە شیمل (ئەڵمانیا)

١٩٩٤ – جۆرج سیمپرون (ئیسپانیا)

١٩٩٣ – فریدریک شۆرلیمەر (ئەڵمانیا)

١٩٩٢ - ئامۆس ئۆز (ئیسرایل)

١٩٩١ – جۆزیف کۆنراد (هەنگاریا)

١٩٩٠ – کارڵ دیدیسیوس (ئەڵمانیا)

١٩٨٩ – ڤاسلڤ هاڤل (چیکوسلۆڤاکیا)

١٩٨٨ – سیگفرید لینز (ئەڵمانیا)

١٩٨٧ – هانس جۆنس (ئەڵمانیا)

١٩٨٦ – ولیدسلاڤ بارتۆسزکی (پۆڵۆنیا)

١٩٨٥ – تیدی کۆلێک (ئیسرایل)

١٩٨٤ – ئۆکتاڤیۆ پاز (مەکسیک)

١٩٨٣ – مانێس سپاربر (نەمسا - فەرەنسا)

١٩٨٢ – جۆرج ف. کێنن (ئەمەریکا)

١٩٨١ – لیو کۆپلیو (یەکێتیی سۆڤێت)

١٩٨٠ – ئەرنیستۆ کاردێنال (نیکاراگوا)

١٩٧٩ – یەهودی مەنوهین (ئەمەریکا - ئینگلتەرا)

١٩٧٨ – ئاستريد ليندگرين (سوید)

١٩٧٧ – لازیز کلاکاوسکی (پۆڵۆنیا)

١٩٧٦ – ماکس فریش (سویسرا)

١٩٧٥ – ئەلفرید گرۆسر (ئەڵمانیا - فەرەنسا)

١٩٧٤ – فریر رۆجر (سویسرا)

١٩٧٣ – زە کلاپ ئۆف (ڕۆما)

١٩٧٢ – جانەس کورزاک (پۆڵۆنیا)

١٩٧١ – ماریۆن گرافین دۆنهۆف (ئەڵمانیا)

١٩٧٠ – ئالڤا، گوننار میردال (سوید)

١٩٦٩ – ئەلێکساندەر میشەرلیچ (ئەڵمانیا)

١٩٦٨ – لیۆپۆل سیدار سینگهۆر (سەنێگال - فەرەنسا)

١٩٦٧ – ئارنست بلۆخ (ئەڵمانیا)

١٩٦٦ – ئەگوستین کاردینال بی (ئەڵمانیا). و. ئا. ڤیسەر ت هۆفت (هۆڵەندا)

١٩٦٥ – نیلی ساچس (ئەڵمانیا - سوید)

١٩٦٤ – گابریال مارکێل (فەرەنسا)

١٩٦٣ – کارل فریدریک ڤۆن وایزاکر (ئەڵمانیا)

١٩٦٢ – پاوڵ تیلیک (ئەڵمانیا - ئەمەریکا)

١٩٦١ – سارڤیپالی ڕادهاکریشنان (هیندستان)

١٩٦٠ – ڤیکتۆر گۆلانچز (ئینگلتەرا)

١٩٥٩ – تێۆدۆر هیوس (ئەڵمانیا)

١٩٥٨ – کارڵ یاسپرس (ئەڵمانیا)

١٩٥٧ – سۆرتن ویلْدر (ئەمەریکا)

١٩٥٦ – ڕاینهۆڵد شنایدەر (ئەڵمانیا)

١٩٥٥ – هێرمان هیسە (سویسرا)

١٩٥٤ – کارل جێکەب بروکهارد (سویسرا)

١٩٥٣ – مارتین بوبر (ئەمسا)

١٩٥٢ – ڕۆمانۆ گواردینی (ئیتالیا)

١٩٥١ – ئەلبێرت شویتزر (ئەڵمانیا)

١٩٥٠ – ماکس تاو (ئەڵمانیا)

"باوکم دوو ساڵ پێش مردنی باوڵێکی بچووکی دامێ، کە پڕ بوو لە دەفتەر، نووسین و دەستنووسەکانی خۆی."

ئۆرهان پاموک لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦دا، کاتێک خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی وەر گرت، وتارێکی پێشکەش کرد بە ناوی *باوەڵەکەی باوکمـەوە*. ئەم وتارە عاتفییەی لە ناخەوە ڕۆحی هەوڵی سیودوو ساڵ نووسەربوونی پاموک پیشان دەدات، لە هەموو دنیادا دەنگێکی گەورەی دایەوە. دوو وتاری تری پاموک لەم کتێبەدایە، کە لەبارەی هەمان بابەتی نووسین و ژیانەوە لە کاتی پەسەندکردنی دوو خەڵاتی تردا پێشکەشی کردووە، کە وەک دەقێکی بنچینەیی لەم کتێبەدا ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام هەمان ئەم بابەت و دەردانەی بە تێڕوانین لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە نووسیوە. پاموک لە نیسانی ساڵی ٢٠٠٦دا، کاتێک لەلایەن گۆڤاری *ئەدەبیاتی دنیاوە* خەڵاتی پەتەربورگی وەر گرت کە لە ئەمەریکا بڵاو دەبێتەوە، وتارێکی پێشکەش کرد بە ناوی *ئەو نووسەرەی ئاماژەی بۆ دەکرێت*، ئەم وتارە باس لە باری دەروونیی نووسەربوون و پێویستیی ویستی بوونبەنووسەر و ئەزموونەکانی دەکات. لە تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥دا، کاتێک لەلایەن یەکێتیی بڵاوکەرەکانی ئەڵمانەوە خەڵاتی ئاشتیی پێ بەخشرا، وتارێکی بە ناوی *لە قارس و فرانکفۆرتـەوە* پێشکەش کرد، کە باس لە هێزی نووسەر دەکات کاتێک خۆی دەخاتە جێگەی کەسانی تر، لێکۆڵینەوە لە ئەنجامە سیاسییەکانی ئەم بەهرە زۆر مرۆییە دەکات.

کتێبێکی شەخسی زۆر بەهادارە لەبارەی بابەتەکانی وەک نووسین، ژیان، نووسەری چییە، بۆچی دەبین بە نووسەر، سەبری نووسەربوون و نهێنییەکانی هونەری ڕۆمانەوە.






٢٠٠٠ دینار